تەحسین نامیق

# کەرکوك

## ئاوڕێك لەڕابردوو، دیدێك بۆ ئایندە

مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك)
سلێمانی ـ گەڕەکی سەرچنار ـ ١٢١
کۆلانی ـ ٤٤
ژ.خانوو ـ ١

* ناوی کتێب: کەرکوک ئاوڕێک لەڕابردوو، دیدێک بۆ ئاینده
* نوسەر: تەحسین نامیق
* نەخشەسازیو بەرگ: فەهمی جەلال
* تایپ: جوان، نیاز، لاڤە
* تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
* چاپی یەکەم: سلێمانی ٢٠٠٩
* ژمارەی سپاردن: (١٧٠٤) ی ساڵی ٢٠٠٩ ی وەزارەتی رۆشنبیری
* ژمارەی زنجیرە: (٣١٠)
* چاپ: دەزگای چاپو پەخشی حەمدی
لەبڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ک). ساڵی ٢٠٠٩

# پێشکەشە

بەسەرجەم ئەندامانی ڕێکخستنەکانی ناوەوە لەسنوری

کەرکوک وناوچە جێناکۆکەکان

# پێڕست

## پێشەکی :

گرنگیدان بەمەسەلەی کەرکوك لەسەرجەم بوارەکانی (مێژوویی - جوگرافی - سیاسی - ئابوری - کۆمەلایەتی - فەرهەنگی - کەلتوری ...) ئەرکی سەرجەم پێکهاتەکانی (کورد - تورکمان - عەرەب - کلدۆئاشور)ە، بەمەبەستی تێگەیشتنی زانستیانەی پێگەی ستراتیژی شارەکەو دروستکردنی خوێندنەوەیەکی واقعبینانەی هاوبەش بەئامانجی ئاراستەکردنی کێشەکە بە ئاقاری چارەسەر، لەسەر بنەمای (ئاشتیو پێکەوە ژیان)، کە لەئەمرۆدا کێشەکە مەودایەکی نێودەوڵەتی وەرگرتووە.

لەم پێشەکیەدا، ئاماژە بەوە دەکەین ناوهێنانی کەرکوك بە ناونیشانی تەنها پارێزگایەك نایەت، بەڵکو ناونیشانی تەواوی ناوچەکانی هەرێمی کوردستانە، کە ئەمرۆ بە ناوچە جێناکۆکەکان دەناسرێت، کە لەمێژووی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردا، جەوهەرو کرۆکی مەسەلەی کوردستانە..

بابەتی (**کەرکوك ئاورێك لەڕابردوو، دیدێك بۆ ئاینده**) هەوڵدانێکە بۆ خستنەڕووی بارودۆخی (مێژوویی - سیاسی) ناوچەکە لەسەردەمە جیاوازەکانی مێژوودا.

لەسەردەمی مێژووی کۆندا، لەدەرئەنجامی شالاوی هێرشی هێزە داگیرکەرە یەك لەدوای یەکەکانی ئیمپراتۆریەتە جیاوازەکان، بەشێوەیەکی گشتی ناوچەکە ببووە مەیدانی شەڕو شانۆی پێکدادانی ئەو هێزانەو ئائارامی باڵی بەسەردا کێشابوو.

لەسەردەمی مێژووی هاوچەرخیشدا، لەپاش شەڕی یەکەمی جیهان، بەپێی پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان، پارێزگای کەرکوك لەچوارچێوەی سنوری جوگرافی دەوڵەتی عیراقدا جێگیرکرا.

لەو هەلومەرجەشدا، ناوچەکە لەئەنجامی پیادەکردنی سیاسەتی شۆفێنانەی رژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عیراقی، ڕووبەڕووی پرۆسەی گۆڕینی باری دیموگرافیو ئیتنۆگرافی بۆوە، لەڕێگەی فشارخستنە سەردانیشتوانی ڕەسەنی ناوچەکە بەڕاگواستنو کۆچپێکردنیانو هێنانی خانەوادەی ناوچەکانی ترو نیشتەجێکردنیانو دابڕینی قەزاو ناحیەکانی پارێزگای کەرکوكو جێبەجێکردنی پرۆسەی ئەنفالو پیادەکردنی تەواوی سیاسەتی ناعادیلانە بەرانبەر بەناوچەکە.

لەپاش پرۆسەی ئازادی عیراقیشدا، بەپێی بەرنامەی کاری حکومەتەکانی (د. ئەیاد عەلاوی - د. ئیبراهیم جەعفەری - د. نوری مالکی)و سەرجەم مادە دەستوریو یاساییەکانی (٥٣ - ٥٨ - ١٤٠ - ٢٣) و دەستێوەردانی سیاسەتی ئقلیمیو نێودەوڵەتی، ناوچەکە لەهەلومەجێکی سیاسی دژواردایەو ساغکردنەوەی چارەنوسی بەهەڵپەسێردراوی ماوەتەوە.

لەهەمان کاتدا ئەم بابەتە، هەوڵێکە بۆ خستنەڕوی پێناسەو واقعی ناوچە جێناکۆکەکانو هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی سەرکردایەتی سیاسی کورد لەئاست ناوچە جێناکۆکەکان، لەسەردەمە جیاوازەکانی دوای دروستبوونی دەوڵەتی عیراقیو ڕوونکردنەوەی پێشینەی سیاسی پێکهاتەکانو هەڵوێستیان لەئاست ساغکردنەوەی چارەنوسی ناوچەکە، هەڵسەنگاندنێکی گشتیو هەمەلایەنەی هەلومەرجی سیاسیو ئیداری،

بەئامانجی هەڵهێنجاندنی ڕاسپاردەی پێویست بە ئاقاری چارەسەرکردنی کێشەکەی لەخۆگرتووە.

بەو هیوایەی ئەم بابەتەش بەرهەمێك بێت، لەخزمەتی دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەو ئەدەبیاتی سیاسی کوردی لەبواری لێکۆڵینەوەی سیاسەتی (پاکتاوی ڕەگەزیدا).

کەرکوك، یەکێکە لەشارە دێرینەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، دەست نیشانکردنی مێژووی دروستبوونی بۆچوونی جیاوازی لەسەرە، بەشێوەیەکی گشتی بۆ سەدەکانی پێش زایین دەگەڕێتەوە، پێگەی مێژوویی خۆی لەشارستانێتی سەدە جیاوازەکاندا دەبینێتەوە[1]

شاری کەرکوك لەسەرچاوەکانی مێژووی کۆنو نوێدا بە چەندین شێوە نێو براوە، کە دەگەڕێتەوە بۆ گرنگی شارەکەو پەلاماردانی لەلایەن ژمارەیەکی زۆری داگیرکەرەوە، کە هەریەکەیان ناوێکیان بەسەردا سەپاندووە لەوانە (ئارابخا ـ کرخ سلوخ ـ کەرخینی ـ کوڕ کوڕ ـ کاری کوك ـ گڕ گڕ ـ گرمکان ـ کەرکوك ـ تأمیم)[2].

شاری کەرکوك بەپێی گۆڕانە مێژووییەکان ڕەنگدانەوەی ژیانی کۆمەڵایەتیو ئابووریو سیاسیو شارستانێتی سەردەمە جیاوازەکان بووە. سەرچاوە مێژووییەکان زۆر کەم ئاماژە بەوە دەکەن، کە دۆخی شاری کەرکوك لەسەردەمە جوداکانی مێژوودا چۆن بووبێت[3]. بەڵام گومان لەوەدا نییە ئەم شارە ژیانی سیاسیو کارگێڕی بەجۆرێك لەجۆرەکان تێدا بەرقەرار بووە. بەپێی سیستمە کارگێڕیەکانی سەردەمی (گۆتی ، لۆلۆیی، خۆری ، ئاشوری، میدی، هەخامەنشی، ڕۆم، سلوقی، فرثی ، ساسانی ، موسوڵمان ، مەغۆڵ، سەفەوی ، عوسمانی ، بەریتانیو عیراقی)[4]

---

[1] د. جمال رشید. كركوك فى العصور القديمه. منشورات ئاراس اربيل ٢٠٠٢ص٢٨

[2] عباس العزاوى . دراسات تاريخيه حول كركوك

[3] پشکۆ حمە تاهیر. شاری کرکوك ل٥٧

[4] پشکۆ حمە تاهیر . شاری کرکوك ل٢١ ـ٤٢

کەرکوك‌و ناوچەکانی دەوروبەری، بەهۆی پێگەی جوگرافی‌و ستراتیژی خۆی، بەدرێژایی مێژوو بەرشالاوی جۆراوجۆری هێزە داگیراکەرەکان کەوتوە، کە نۆردوگاو قەلای سەربازی بەهێزیان تیادا دروستکردووەو لەهەولی بەردەوامدا بوون بۆ نیشتەجێکردنی پێکهاتەکانی خۆیان لەم ناوچانە، کە هۆکاری دروستبوونی فرە پێکهاتەیی ناوچەکەیە. کەرکوك بەپێی سنوری جوگرافی‌و مێژوویی ئێستای، بەشێك بووە لەکوردستان. لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا، لەسالی ١٥٨٣ ز ویلایەتی شارەزوور لەژێردەسەلاتی کارگێری ئیمارەتی ئەردەلاندا بووە، کە کەرکوك ناوەندی ئەو ویلایەتە بووە.

لەکۆتاییەکانی سەدەی حەڤدە، کەرکوك بوو بە بەشێك لەسنوری دەسەلاتی فەرمانڕەوایی ئیمارەتی بابان. بەکۆتایی هاتنی دەسەلاتی فەرمانڕەوایی ئیمارەتی بابان لەسالی ١٨٥١ ز، سیاسەتی نوێی دەولەتی عوسمانی بەناوەندیکردنی دەسەلات بوو، لەسەرجەم هەرێمەکانی خۆیدا.

ئەوەی زیاتر باسی لێوە دەکرێت، کۆتایی دەسەلاتی سەردەمی دەولەتی عوسمانییە. لەڕووی مێژووییەوە تاکۆتایی سەدەی حەڤدە، ویلایەتی شارەزوور، کە مەلبەندەکەی کەرکوك بووە، سەربەخۆ بووە لەڕووی کارگێڕییەوە، وەك ویلایەتەکانی تری دەولەتی عوسمانی راستەوخۆ بەئەستەنبولەوە بەسترابۆوە. (٥)

بەلام لەسەرەتای سەدەی هەژدەو دواتریش لەسەردەمی فەرمانڕەوایی مەمالیکەکان لەبەغدا (١٧٥٠ ـ ١٨٣١ز) ویلایەتی شارەزوور زیاتر کەوتە ژێر دەسەلاتی والیەکانی بەغدا، ئەمەش رەنگدانەوەی لەسەر پەیوەندییەکانی

---

٥- ت احمد شنتاف وأخرون. دائرة المعارف الأسلامية ص٣٨٦ ــ ٣٨٧

هـەردوو لادا هـەبوو، دەسـەڵاتدارانی کـەرکوك لـەم سـەردەمەدا زیـاتر وابەستەی ویلایەتی بەغدا بوون، بەجۆرێك دەسەڵاتـدارانی بەغدا، هێزی کەرکوکیان زیاتر بۆ مەبەستە سەربازییەکانی خۆیـان بـەکارهێناوە، کـە بێگومـان ئـەم دەسـەڵاتەی بەغـدا بەسـەر کەرکوکـدا وای کردبـوو، کـە ویلایەتی شارەزوور نەتوانـێ لەبەرانبەر فەوارەو دەسـەڵاتە جیاجیاکـانی دەوروبەریـدا سیاسـەتێکی وای هـەبێت، کـە گوزارشـت لەبەرژەوەنـدی راستەقینەی خۆی بکات.

لەگـەڵ ئەوەشـدا، هەنـدێك جـار دەسـەڵاتدارانی کـەرکوك بەمەبەسـتی کەمکردنەوەی دەسەڵاتـی ویلایەتی بەغدا، هەڵوێستیان وەرگرتـووە، وەك ئەوەی لەساڵی ١٨١٢ز دا جۆرێك لەهاوپـەیمانی لـەنێو (کـەرکوكو موسـڵ) دروستبوو بوو.

کـاتێکیش عوسمانییـەکان لەسـاڵی ١٨٣١ دوای گەڕانـەوەی دەسـەڵاتی ناوەندیعێۆ بەغداو کۆتایی هێنان بە دەسەڵاتی مەمالیکەکان، هەرچەندە کـەرکوك وەك مەڵبەنـدی ویلایـەتی شـارەزوور مایـەوە، بـەڵام ویلایـەتی بەغدا وەك جاران دەسەڵاتی بەسەریدا دەڕۆیشت(٦).

لەناوەڕاسـتی سـەدەی نـۆزدەوە، ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی هـەوڵی پـەیڕەوکردنی سیاسـەتێکی کـارگێڕی ناوەندیـدا، کـە یاسـای کـارگێڕی هەرێمەکان وەك یاسایەکی نوێ لەساڵی ١٨٧٠ لەلایەن (مەدحت پاشـا)ە وە دەرچووە، لەساڵی ١٨٧٩ پێکهاتەی ویلایەتی شارەزووری گۆڕیو سنورەکەی فـراوان کـرد، کـە موسڵیـشی گرتـەوە، موسـڵ بـوو بـە ناوەنـدی ویلایـەتی

---

٦ - سعدی حسین. كردستان و الامبراطورية العثمانية دراسة التطور السياسي ص٦٤

شارەزوور[٧]، لەو مێژووە بەدواوە کەرکوك سیفەتی مەڵبەندی ویلایەتی لێسەندرایەوەو ویلایەتی شارەزووریش بە سەر سێ موتەسەریفییدا دابەشکرا:

١- موتەسەریفیەی موسڵ

٢- موتەسەریفیەی سلێمانی

٣- موتەسەریفیەی کەرکوك

**سیستەمی کارگێڕی موتەسەریفیەی کەرکوکیش بەم شێوەیە بوو:**

١- قەزای کەرکوك

٢- قەزای هەولێر

٣- قەزای ڕەواندز

٤- قەزای کفری

٥- قەزای کۆیە

٦- قەزای رانیە

لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە، تا سەدەی نۆزدە، هیچ جۆرە ئامارو سەرژمێریەك لەشاری کەرکوکدا ئەنجام نەدراوە تا بکرێتە بنەمایەکی دروست، بۆ زایننی پێکهاتەو ژمارەی دانیشتوانی، بەلام سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە دانیشتوانی ڕەسەنی ئەم شارە کوردن، وەك لەنووسینی گەڕیدە و رۆژهەلاتناسەکاندا دەردەکەوێت.

دوای رووخانی میرنشینی بابانو دروستکردنی ویلایەتی موسڵ لەساڵی ١٨٧٩ /دا دەوڵەتی عوسمانی بەمەبەستی گۆڕینی باری دیموگرافی شارەکە،

---

[٧] د. خليل اسماعيل محمد. كركوك. دراسات في التكوين القومي للسكان ٢٠٠٢ص٩٥

سیاسەتی بەتورككردنی گرتەبەر لەڕێگەی نیشتەجێكردنی خێزانی فەرمانبەرە سەربازیو مەدەنیەكانی دەوڵەت، بەتایبەت لەسەردەمی ئیتحیادیەكان (لەڕۆژی ١٩٠٨/٨/٣١ دەست بەكاربوون)[٨]، كە سیاسەتی شۆفینی دژ بە نەتەوە ناتوركەكانی دەوڵەتی عوسمانی گرتە بەر، شاری كەركوك بەشێكی زۆری ئەو سیاسەتە شۆفینیەی تیادا پیادەكرا، بەتایبەت كە لقێكی كۆمەڵەی (ئیتحادو تەرەقی) لەشاری كەركوكدا لەماوەی ١٩٠٨- ١٩١٨ لەهەوڵی سەپاندنی كلتورو زاڵبوونی زمانی توركی بووە بەسەر دانیشتوانی شارەكەدا.

لەڕووی ئابووریەوە، شارەكە بەهۆی پێگەی ستراتیژیو بوونی رووبەری فراوانی زەوی كشتوكاڵیو ئاووهەوای گونجاو و سامانی سروشتی ژێر زەوی لە(نەوت – بەردی خەڵوز – بەردی مەڕمەڕ -- كانی خۆی ....) گرنگی تایبەتی خۆی هەبووە.

٨ د. عەبدوللا عەلیاوەنی. كوردستان لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا. ٢٠٠٤ ل٢٢٠

پاش شەڕی یەکەمی جیهان (١٩١٤ ـ ١٩١٨ز)و شکستی دەوڵەتی عوسمانیو بالادەستی سوپای بەریتانی لەسنوری ویلایەتەکانی (بەغدا ـ موسڵ ـ بەسرە) گۆڕانکاری گەورە لەپێکهاتەی کارگێڕی ناوچەکەدا دروست بوو. بە پێی بەرژەوەندییە سیاسیو سەربازییەکانی خۆی، لەو کاتەدا ئەو ناوچانەیان لەڕوی کارگێڕییەوە بەشێوازێکی نوێ دابەش کردەوە، کە لە ١٤ لیوا پێکدەهات، کەرکوکیش یەکێك بوو لەو لیوایانەو یەکە ئیداریەکانی بریتی بوون لە[٩]:

١ـ قەزای ناوەند　　　　٢ـ قەزای چەمچەماڵ

٣ـ قەزای کفری　　　　٤ـ قەزای گل

لەسەر فەرمانی حاکمی سیاسی گشتی (کۆلۆنێل ویلسن)، ئەفسەری سیاسیو سەربازی ئینگلیز (مێجەر نوئیل) سەرپەرشتی کەرکوکی دەکرد.

لەو ڕووەوە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان نەخشەی سیاسی جیهانیان بەپێی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان دادەڕشت، بەتایبەت لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا بەبێ ڕەچاوکردنی جیاوازییە نەتەوەییو ئایینیو مەزهەبییەکان.

بۆ ئەم مەبەستەش چەندین ڕێککەوتننامەو پەیماننامەیان لەمیانەو دواى شەڕی جیهانی یەکەمدا ئیمزا کرد.

[٩] د. خليل اسماعيل محمد. كركوك. دراسات في التكوين القومي للسكان ٢٠٠٢ص٦٩

## ـ ڕێککەوتننامەی سایکس ـ بیکۆ ١٩١٦

لەمیانەی شەڕی یەکەمی جیهان، لەئازاری ١٩١٦ ڕێککەوتننامەیەکی نهێنی لەنێوان بەریتانیاو فەرەنسا بەناوی ڕێککەوتننامەی (سایکس ـ بیکۆ) ئیمزا کرا. بەریتانیاو فەرەنسا بەهاوبەشی روسیا تاوتوێی ڕێکخستنی داهاتووی رۆژهەلاتی ناوەڕاستو دابەشکردنی ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییان لەنێوان خۆیاندا کرد، بەپێی ئەو ڕێککەوتننامەیە بەشی هەرە زۆری خاکی کوردستان بەسەر ئەو سێ دەوڵەتەدا دابەشکرابوو، بەلام سەرکەوتنی شۆڕشی بورژوازی دیموکراسی رووسی لەشوباتی ١٩١٧ بووە مایەی ئاشکرا کردنی ئەو ڕێککەوتننامە نهێنییەو هەڵوەشانەوەی[١٠].

## ـ کۆنگرەی ڕێککەوتن ـ پاریس ١٩١٩

لەم کۆنگرەیەدا دەوڵەتانی هاوپەیمانی زلهێز، رەزامەندبوون بەجیاکردنەوەی (ئەرمینیا ـ سوریا ـ میزۆپۆتامیا ـ کوردستان ـ فەلەستین ـ نیمچە دورگەی عەرەب) لەئیمپراتۆریەتی عوسمانی. بۆ یەکەم جار لەم کۆنگرەیەدا زاراوەی کوردستان وەك زاراوەیەکی نوێ چووە فەرهەنگی دیبلۆماسییەوە. شەریف پاشا وەك نوێنەری کورد هاوشانی نوێنەرانی ئەرمەنو ئاشوری بەشداری لەم کۆنگرەیەدا کردبوو، بەلام نەیانتوانی کاریگەری لەسەر سیاسەتی ولاتە زلهێزەکان دابنێن[١١].

---

١٠ د. حامد محمود عيسى القضية الكردية في العراق. ص٩٩

١١ د. حامد محمود عيسى. القضية الكردية في العراق ص١٠٢

## ڕێککەوتننامەی سیڤەر ـ ١٩٢٠

لەمانگی ئابی ١٩٢٠ ڕێکەوتننامەی سیڤەر بەسەر تورکیادا سەپێنرا، لەم ڕێکەوتننامەیەدا (شەریف پاشا) سەرۆکایەتی وەفدی کوردی کردووە، مادەکانی پەیوەست بە کورد لەم ڕێککەوتنامەیەدا بریتی بوون لەمادەکانی (٦٢ ـ ٦٣ ـ ٦٤).

## بە پێی ئەو ماددانە

ـ تورکیا هەموو ئەو ناوچانە لەدەست دەدات، کە کوردی تێدا نیشتەجێیە، مەبەست لەو ناوچانەش، کوردستانی تورکیایە.

ـ پێدانی مافی خودموختاری بۆ کورد لەکوردستان، دواتر مافی سەربەخۆیی لەحاڵەتێکدا میللەتی کورد داوا بکات.

بەڵام مافی خود موختاری کورد لەڕێککەوتنامەی سیڤەردا پابەند بوو بەهەندێك مەرج:

١ـ ڕاپرسی بۆ خەڵك ئەنجام بدرێت لەناوچە کوردنشینەکان، کە ئایا جیابوونەوەیان دەوێت لەتورکیا؟

٢ـ ئەم ڕاپرسیە دەخرێتە بەردەستی کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبة الامم) بۆ بڕیاردان، کە ئایا کورد توانای مافی سەربەخۆیی هەیە یاخود نا؟

٣ـ ئەگەر کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبة الامم) بڕیاری سەربەخۆیی بۆ کورد هەڵبژارد، ئاگاداری تورکیا دەکرێتەوە بۆ جێبەجێکردن، هاوپەیمانان ڕێگرنابن لەلکاندنی کوردستانی باشوور (ویلایەتی موسڵ) بۆ ئەو دەوڵەتە کوردییەی کە پێشنیار کراوە.

بێگومان ئـەم ڕێککەوتنامەیـە لەلایـەن (مـستەفا کـەمال)ەوە بەتونـدی ڕەتکرایـــەوە، ســـەرجەم هەوڵـــەکانی بـــۆ جێبەجێنـــەکردنی ئـــەم ڕێککەوتنامەیە خرایە گەڕ.

بەهۆی سەرکەوتنەکانی سوپای تورکی لەساڵی ١٩٢١و کاریگـەری تـورك بەسەر کوردەکانو دابەشبوونی کورد لەنێوخۆیاندا، هۆکاربوون بـۆ بـەبن بەست گەیشتنی ڕێککەوتننامەی سیڤەر[١٢].

## ـ پەیماننامەی لـــۆزان ١٩٢٣

بەپێی ئەم پەیماننامەیە تورکیا سـەرجەم ناوچـە ڕەسـەنەکانی خـۆی پاراســت، ویلایــەتی موســڵ (کوردســتانی باشــور) بــووە کێــشەی نێــوان بەریتانیاو تورکیا، ئەم کێشە دواخرا.

لەم پەیماننامەیەدا باسی مەسەلەی کوردی تێدا نەهاتووە، تـەنها بـاس لەوە دەکـات کـە پێویـستە تورکیـا ڕێـزی مافـە ئـایینیو ڕۆشـنبیرییەکانی کەمە نەتەوەکان بگرێت[١٣].

## کێشەی ویلایەتی موسڵ (کوردستانی باشـــور) ١٩٢٥

ویلایەتی موسڵ، کە سەرجەم لیواکانی (موسـڵ ـ کـەرکوك ـ سلێمانی ـ هـەولێر)ی دەگرتـەوە، سەرچـاوەی کێـشەکە لـەنێوان بـەریتانیاو تورکیـا دەگەڕێتـەوە بـۆ دەوڵەمەنـدی ناوچـەکە لەنـەوت. کۆمەڵـەی نەتـەوەکان

---

[١٢] باسيلي نيكيتين. الكردة دراسة سوسيولوجيه و تاريخية. ص٣٢٨

[١٣] باسيلي نيكيتن. الكرد. دراسة سوسيولوجيه و تاريخية. ص٣٢٨

(عصبة الامم) بڕیاری پێکهێنانی لیژنەیەکیدا لە ١٩٢٤/٩/٣٠ بەمەبەستی چارەسەری کێشەی ویلایەتی موسڵ. کە پێکهاتبوو لە.

ی. إف فیوسین (سویدی) سەرۆك

تیلیکی (زانای جوگرافیناس) (بەریتانی) ئەندام

کۆلۆنێل پاولس (بەلجیکی) ئەندام

نوێنەری لایەنی (بەریتانی)

نوێنەری لایەنی (تورکی)

تیمێکی یاریدەدەر

دوای تەواوبوونی کاری لیژنەکە، راپۆرتی تایبەتی خۆی پێشکەش بە کۆمەڵەی نەتەوەکان کرد، کە بریتی بوو لە:

١ـ ٨/٥ دانیشتوانی ئەم ویلایەتە کوردن، کە جیاوازن لە تورك و عەرەب.

٢. سنوری عیراقی عەرەبی لەباکوردا تا زنجیرە چیای حەمرینە.

٣. بەپێی سەرچاوە جوگرافیییەکان، لەهیچ سەردەمێکدا ئەم ناوچەیە، بەشێك نەبووە لەعیراق.

لیژنەکە پێشنیاری کردووە بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی، لەحاڵەتێکدا گەر گرنگی بەلایەنی نەتەوایەتی ناوچەکە بدرێت، بەڵام لەحالەتێکدا گەر لایەنی نەتەوایەتی بەهەند وەرنەگیرێت و گرنگی بەلایەنی نابووری ناوچەکە بدرێت لیژنەکە پێشنیاری لکاندنی ویلایەتی موسڵ بەدەوڵەتی تازە دامەزراوی عیراقەوە دەکات بەم مەرجانە.

١. عیراق لەژێر دەسەڵاتی ئینتدابدا بێت بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ.

٢ـ زمانی کوردی زمانی فەرمی ناوچەکە بێتو فەرمانبەری کورد سەرپەرشتی بواری کارگێڕی ناوچەکەی خۆیان بکەن[١٤].

تورکیا دانی بەبڕیاری لیژنەی کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبة الامم) نەنا، تاکو ڕێکەوتنێکی سێ قۆڵی لەنێوان (بەریتانیاو تورکیاو عیراق) مۆرکرا بەبێ ڕەچاوکردنی جیاوازییە نەتەوەییو ئایینیو مەزهەبیەکان.

لەدەرئەنجامی سەرجەم ڕێککەوتننامەو پەیماننامە ئاماژەپێکراوەکان دەوڵەتێکی نوێیان بەناوی دەوڵەتی عیراق لەهەردوو ویلایەتی (بەغداو بەسرە) لەساڵی ١٩٢١ دروستکرد، بۆ بەڕێوەبردنی ئەم دەوڵەتەش (مەلیك فەیسەڵ) یان لەدەرەوەی عیراقەوە هێناو لە ١٩٢١/٨/٢٣ بە مەلیك دایانمەزراند.[١٥]

بەپێی ڕێککەوتننامەی سێ قۆڵی ئاماژە پێکراو لەنێوان (بەریتانیا ـ تورکیا ـ عیراق) ویلایەتی موسڵیش (کوردستانی باشور) خرایە سەر ئەم دەوڵەتە نوێیە، بێ ڕەچاوکردنی هیچ بنەمایەکی یاساییو بەبێ گوێ دانە راپرسی خەڵکی کورد.

بەپێی بەرژەوەندیەکانی وڵاتە زلهێزەکان، لەکۆنگرەی قاهیرە بەئامادەبوونی (ونستون چەرچل) وەزیری وڵاتە کۆلۆنیالەکانی بەریتانیا

---

[١٤] د. عمر ابراهیم توفیق. کردستانیة منطقة کرکوك في مدلولهاو توزیعها الدینی قبل الاسلام و تقریر عصبة الامم ص٣٦

[١٥] د. حامد محمود عیسی القضیة الکردیة في العراق ص٧٣

لەو سەردەمەدا بڕیار لەسەر بنەما نەگۆڕەکانی دەوڵەتی نوێی عیراق درا کە بریتی بوون لە[١٦]

١. باڵا دەستی نەتەوەی عەرەب.

٢. باڵا دەستی عەرەبی سوننە.

٣. سوپای عیراق.

٤. لەبەرچاوگرتنی مافەکانی کورد.

٥. پاشکۆیەتی سیاسی بۆ بەریتانیا.

٦. پاراستنی یەکێتی خاکی عیراق.

پاش وردبوونەوە لەم بنەمایانەی، کە دەوڵەتی نوێی عیراقی لەسەر بنیات نرابوو، دەردەکەوێت ئەو پێکهاتانەی دەچنە چوارچێوەی ئەم دەوڵەتەوە، پێکهاتەیەکی نەگونجاوە لەڕووی (نەتەوەیی - مەزهەبی)یەوەو کەمایەتی عەرەبی سوننە تیایدا باڵا دەست دەکاتو لکاندنێکی نائارەزوومەندانەو زۆرەملێی ئەو ناوچانەیە، کە عیراقی لێپێک دێت، کە بێگومان بەریتانیاو فەرمانڕەوایانی داهاتووی ئەو دەوڵەتە نوێیەش سوود لەجیاوازی (نەتەوەیی - مەزهەبی) وەردەگرن بۆ سەقامگیرکردنی دەسەڵاتی خۆیان، لەهەموو کاتێکیشدا سوپای عیراق ئامادەیە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی داواکاریو ئامانجە نەتەوەییو دیموکراسیەکانی پێکهاتەکانی تر.

لەپاش دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقو پێش ساغکردنەوەی کێشەی ویلایەتی موسڵ، لەساڵی ١٩٢٢ حکومەتی بەریتانیو عیراقی. دانیاننا بە دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی لەکوردستانی عیراق، کە پایتەختەکەی

---

[١٦] حسن العلوي. الشيعة والدولة القوميه في العراق

شاری سلێمانی [17] بێت، داوایانکرد وەفدێکی کوردی سەردانی بەغدا بکات بۆ تاوتوێکردنی سنوری جوگرافی حکومەتی کوردستانو چۆنێتی رێکخستنی پەیوەندی ئابووریو سیاسی لەگەڵ هەردوو حکومەتی بەریتانیو عیراقیدا. لەو هەلو مەرجەدا (شێخ مەحمود) لەهەوڵی ئەوەدا بوو سنوری حکومەتە کوردییەکە تەواوی کوردستان بگرێتەوە بە کەرکوکیشەوە، کە ئەمەش جێگەی رەزامەندی بەریتانیا نەبوو، تەنانەت ئامادەی ئەنجامدانی راپرسیش نەبوون بۆ ساغکردنەوەی سنوری لیوای کەرکوک. [18]

پاش لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە دەوڵەتی عیراقەوە، کەرکوک وەك هەر یەکێك لەلیواکانی عیراق کارەکانی بەڕێوە دەبرا، لەڕووی پێکهاتەی نەتەوەییەوە، کورد تیایدا زۆرینەبوو، وەك لەسەرجەم خولە یەك لەدوای یەکەکانی نوێنەرایەتی پارێزگای کەرکوك بۆ (ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق) لەسەردەمی فەرمانڕەوایی پاشایەتی خانەوادەی هاشمی بەدیدەکرێت (خولی یەکەم ساڵی ١٩٢٥ ـ خولی دووەم ساڵی ١٩٢٨ ـ خولی سێهەم ساڵی ١٩٣٠ ـ خولی چوارەم ١٩٣٣ ـ خولی پێنجەم ١٩٣٤ ـ خولی شەشەم ١٩٣٥ ـ خولی حەوتەم ١٩٣٧ ـ خولی هەشتەم کۆتایی ساڵی ١٩٣٧، خولی نۆیەم ١٩٣٩ ـ خولی دەیەم ١٩٤٣ ـ خولی یازدە ١٩٤٧ ـ خولی دوانزدە ١٩٤٨ ـ خولی سیانزە ١٩٥٣ ـ خولی چواردەو پانزە ١٩٥٤ ـ خولی شازدە ١٩٥٨) لەسەرجەم ئەم خولانەدا ٩٨ نوێنەر، نوێنەرایەتی پارێزگای کەرکوکیان کردووە، کە ٦٠ نوێنەریان کوردو ٢٣ نوێنەریان تورکمانو دوو نوێنەری عەرەبو یەك

---

[17] عبدالرزاق الحسني. تاريخ العراق السياسي ص٢٨٦

[18] د. حامد محمود عيسى. القضية الكردية العراق ص٢٢٧

نوێنـەری كلـدو ئاشـورو ١٢ نوێنــەر ناسـنامەی نەتـەوەییان ونــە لـەنێوان كوردو توركماندا.[19]

ئەوەی تێبینی دەكرێت لەخولی حەوتەمدا سـاڵی ١٩٣٧ وەرچـەرخانێكی نوێ بەدیدە دەكرێت، كـە بـۆ یەكـەم جـار لەنوێنـەرانی شـاری كەركوكـدا یـەك نوێنــەری عــەرەب لەشـەش نوێنــەر، نوێنەرایـەتی شـاری كـەركوك دەكات ئەویش (عاصي العلي) سەرۆكی عەشیرەتی (العبید) بوو.

دەركەوتنی تایبەتمەندی كەركوك لەمێـژووی نوێـدا كاتێـك بـۆ یەكـەم جـار نــەوت لەسـاڵی ١٩٢٧ لەچـاڵە نــەوتی بابـا گوڕگـوڕ دواتـر لەچـاڵە نەوتـەكانی بـای حەسـەن سـاڵی ١٩٥٣و زەمبـوور لەسـاڵی ١٩٥٤ دۆزرایـەوەو دەركـەوت تێكـڕای تێـچونی دۆزینـەوەو بەرهـەمهێنانی نـەوت لەناوچـەی كەركوك كەمترە لەتەواوی ناوچەكانی تری جیهان، بـەهۆی شیاوی بـاری جیۆلۆجی ئەو كێلگانەوە.[20]

ئەو تایبەتمەندیـە نوێیـەی شـاری كـەركوك سـەرنجی فـەرمانڕەوایانو دەسـەڵاتی حكومــەتی عیراقــی راكێــشا، كــە بــیر لەشــێوازێكی نــوێی بەرخوردكردن بكرێتەوە لەگەڵ ئەم شارەو ناوچـەكانی دەوروبەریـدا بـە ئامانجی تێكدانی هاوكێشەی پێكهاتەی شارەكە كـە لـەڕووی نەتەوەییـەوە كورد تیایدا زۆرینەی پێكدەهێنا.

بۆ جـێبەجێكردنی ئەو ئامانجەش، حكومـەتی عـیراق لـەو سـەردەمەدا داهێنانی نوێی لەشێوازی چەوسانەوەی نەتەوایەتی، وەك یەكەم هەنگاوی سیاسـەتی پاكتـاوی رەگـەزی لەناوچـەی كەركوكـدا دەسـت پـێكرد، كـە

---

[19] رۆژنامە ئاسۆ

[20] ئازاد. مێژوی دۆزینەوەو دەرهێنانی نەوت لەكەركوك گۆڤاری كەركوك ژمارە ١.

یەکەمین هەوڵیان بۆ بەعەرەبکردنی پارێزگای کەرکوك لەسەردەمی پاشایەتی لەسەردەستی سەرۆك وەزیرانی عیراقی (یاسین الهاشمی) بوو، ئەویش بەنیشتەجێکردنی عەشیرەتی (العبید) بوو لەساڵی ١٩٣٦و دواتر عەشیرەتی (الجبور) لەدەشتی حەویجەو دابەشکردنی زەوی بەسەریاندا دوای بنیاتنانی پرۆژەی ئاودێری حەویجە[21] ، کە بەقۆناغی یەکەمی سیاسەتی بەعەرەبکردن لەپارێزگای کەرکوك دادەنرێت. کاردانەوەی ئەم سیاسەتەش لەسەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ دەردەکەوێت بە بەراورد لەگەڵ سەرژمێری ساڵی ١٩٢٥، کە ژمارەی دانیشتوانی کورد بەرێژەی ٣٪ کەمی کرد.

قۆناغی دووەمی سیاسەتی بەعەرەبکردن لەگەڵ کودەتای بەعسییەکان لە ساڵی ١٩٦٣ دەست پێدەکات کە شێوەیەکی مەترسیداری لەخۆگرت، ئەویش بەجێبەجێکردنی پرۆسەی ئاوارەکردنو کۆچپێکردنی زۆرەملێی دانیشتوانی ٣٣ گوندی کوردنشینی دەوروپشتی شاری کەرکوكو، لەبەرانبەردا دابەشکردنو بەموڵکایەتیکردنی زەویو زاری ئەو ناوچانە بەو عەشیرەتە عەرەبانەی، کە هێنرابوونە ناوچەکەو پڕچەك کردنیان.

قۆناغی سێیەم دوای کودەتای ساڵی ١٩٦٨ دەست پێدەکات، لەم قۆناغەشدا سیاسەتی پاکتاوی رەگەزی چووە قۆناغێکی مەترسیدارو بەپێی بەرنامەیەکی دارێژراو و جێبەجێکردنی بە قۆناغ، بە مەبەستی گۆڕینی واقعی دیموگرافی شارەکە، کە لەهەڵو مەرجێکی زۆردژوارو بێ وێنە لەمێژووی ناوچەکە رەنگی داوەتەوە.

---

[21] د. خليل اسماعيل محمد. كركوك دراسات في التكوين القومي للسكان ٢٠٠٢ ص١٥

سیاسەتی سێ کۆچکەی (تەبعیس - تەرحیل - تەعریب) دروشمی سەرەکی رژێمی بەعس بوون، رێوشوێن‌و هەنگاوەکانی رژێمیش لەم قۆناغەدا چڕدەبێتەوە لە:

١ـ گوێزانەوەو دوور خستنەوەو خانەنیشنکردنی فەرمانبەران‌و کرێکارانی کورد لەشارەکە [٢٢]

٢. بە زۆر راگواستنی خێزانی کورد (تەرحیل) [٢٣]

٣. هێنانی خێزانی عەرەب بۆ ناوچەکەو ئاسانکاری نیشتەجێکردنیان (تەعریب) [٢٤]

٤ـ اطفاء کردن‌و سڕینەوەی گرێبەستی زەوی‌و زاری کشتوکاڵی ناوچەکانی (ساڵەیی - شوان - لەیلان......) [٢٥]

٥. دروستکردنی نۆردوگای (تەعریب) لەو ناوچانە. وەك نوردوگاکانی (العز – العبور – الصمود ......). [٢٦]

٦ـ قەدەغەکردنی خوێندن بەزمانی کوردی لەهەموو قۆناغەکانی خوێندندا. [٢٧]

٧. گۆڕینی ناوی سەرجەم خوێندنگا کوردییەکان.

---

[٢٢] بەلگە نامەی ژمارە ١. قرار رقم ٧٦ صادر من مجلس قیادة الثورة الی / وزارة النفط الموضوع/ قرار مجلس قیادة الثورة

[٢٣] بەلگەی نامەی ژمارە ٢ الی/ وزارة الداخلیة. الشئون الامنیة م/ معلومات ترحیل عام /١٩٩٨ بەلگە نامەی ژمارە٣/ الی المکتب الخاص الموقر / الدیوانم/ ترحیل عام ١٩٩٩ وانهاء الخطة الخمسیة.

[٢٤] بەلگە نامەی ژمارە ٤. الی / لجنة الشمال / السکرتاریة م/ تعریب مدینة کرکوك

[٢٥] بەلگە نامەی ژمارە ٥. الی/ محافظة التأمیم الموضوع/ أراضي زراعیة

بەلگە نامەی ژمارە ٦. الی/ مدیریة زراعة التأمیم الموضوع/ اجرارات وتعلیمات

[٢٦] بەلگە نامەی ژمارە ٧ م/ تخصیص اراضی زراعیة

[٢٧] بەلگە نامەی ژمارە ٨ الی/ مدیریة التربیة والتعلیم العام. التأمیم الموضوع / تعیم

٨- گۆڕینی ناوی گەڕەکە کوردییەکان. بەناوی عەرەبی.

٩- دروستکردنی گەڕەکی نوێ بۆ عەرەبە هاوردەکان وەك گەڕەکەکانی (حي المثنى، حي البعث، حي الكرامة، حي النصر، حي الحجاج، حي الخضراء ، غرناطة ، العروبة ، دور الأمن ، دور العمل الشعبي، دۆميز، واحد حزيران، قادسية الاولى، قادسية الثانية، ألفين دار، حي الضباط، حي الواسط، الوحدة، قوتيبة)

١٠- گوڕێنی ناوی پارێزگای کەرکوك بەپارێزگاری التأميم بەپێی بڕیاری ژمارە ٤١ لەڕۆژی ٢٩/١/ ١٩٧٦.[٢٨]

١١- فشار خستنە سەر دانیشتوانی شارەکە لەکوردو تورکمان بۆ گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەییان (تصحيح القومية). بەپێی بڕیاری ١٩٩ لەڕۆژی ٢٠٠١/٩/٦ .[٢٩]

١٢- قەدەغەکردنی ناونانی لەدایك بووانی نوێ بەناوی کوردی. بەپێی بڕیاری ژمارە ٢٢٩٣/١ لەڕۆژی ١١/٢١ ٢٠٠١

١٣ ـ دابڕینی قەزا کوردنشینەکانی (چەمچەماڵ ـ دووز ـ کفری.....) لەپارێزگای کەرکوكو بەستنەوەیان بەپارێزگاکانی تر لەڕووی کارگێڕیەوە، بەمەبەستی بچوکردنەوەی سنوری جوگرافی پارێزگاکەو تێکدانی هاوکێشەی پێکهاتەی شارەکە بەقازانجی نەتەوەی عەرەب.

أ- دابڕینی قەزای چەمچەماڵو گوێزانەوەی بۆ سەرپارێزگای سلێمانی بەپێێ بڕیاری ژمارە٦٠٨ لەڕۆژی ١٩٧٥/١١/٦.[٣٠]

---

[٢٨] بەلگە نامەی ژمارە ٩ مرسوم جمهوری رقم ٤١ في ١٩٧٦

[٢٩] بەلگە نامەی ژمارە١٠ الى/ الجهاز المركزي للأحصاء / التأميم الموضوع / تصحيح القومية

بەلگە نامەی ژمارە ١١ الى/ المكتب الخاص الموقر / الديوان م/ احصاء ١٩٩٩

ب- دابڕینی قەزای دووز و گوێزانەوەی بۆ سەر پارێزگای سەلاحەدین (تکریت) بەپێی بڕیاری ژمارە ٤١ لەڕۆژی ٢٩/ ١/١٩٧٦. [٣١]

جـ - دابڕینی قەزای کفریو گوێزانەوەی بۆسەرپارێزگای دیالە بەپێی بڕیاری ژمارە ٦٠٨ لەڕۆژی ٦/ ١١/ ١٩٧٥.[٣٢]

د – دابڕینی قەزای کەلارو گوێزانەوەی بۆ سەر پارێزگای سلێمانی بەپێی بڕیاری ژمارە ٦٠٨ لەڕۆژی ١٩٧٥/١١/٦. [٣٣]

١٣ ـ لوتکەی سیاسەتی شۆڤینیانەی ڕژێمی بەعس، جێبەجێکردنی پرۆسەی ئەنفال بوو لەهەرێمی کوردستاندا، کە پشکی پارێزگای کەرکوك وێرانکردنی زیاتر لە ٧٠٠ گوندو بێ سەرو شوێن کردنی بەشی زۆری دانیشتوانەکەی بوو.

لەپرۆسەی جێبەجێکردنی قۆناغەکانی پاکتاوی ڕەگەزیو پیادەکردنی سیاسەتی پێشێلکردنی مافەکانی گەلی کورد لەلایەن سەرجەم ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکانی هەردوو سیستەمی فەرمانڕەوایی پاشایەتیو کۆماری لەعیراقدا، میللەتی کورد بۆ پاراستنی قەوارەی نەتەوایەتیو بەدیهێنانی ئامانجەکانی، بەناچاری ڕێگەی خەباتی (سیاسی، ڕێکخراوەیی، دیبلۆماسی، چەکداری، دانوستان)ی لەچوارچێوەی (بزووتنەوەیرزگاری خوازی گەلی کورد) گرتە بەر.

---

[٣٠] بەلگە نامەی ژمارە١٢. مرسوم جمهوری رقم ٤١ في ١٩٧٦

[٣١] بەلگەی نامەی ژمارە٩مرسوم جمهوری رقم ٤١ في ١٩٧٦

[٣٢] بەلگەی نامەی ژمارە ١٢. مرسوم جمهوری رقم ٦٠٨في ١٩٧٥/١١/٦

[٣٣] بەلگەی نامەی ژمارە ١٢. مرسوم جمهوری رقم في ١٩٧٥/١١/٦

پێکهاتەی کورد لەشاری کەرکوکدا بەشداری چالاکانەیان لەبواری ڕێکخراوەیی سەرجەم ڕێکخراوەکانی (حزبی هیوا، کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد، حزبی رزگاری کورد ، حزبی شۆڕش ، پارتی دیموکراتی کوردستان ، یەکێتی نیشتمانی کوردستان ...)و لەسەرجەم شۆڕشەکانی شێخ مەحمود (١٩١٩ ـ ١٩٤١)و شۆڕشی بارزان (١٩٣١ ـ ١٩٤٧) لەسەردەمی سیستەمی پاشایەتیو شۆڕشی ئەیلول (١٩٦١ ـ ١٩٧٥)و شۆڕشی نوێ (١٩٧٦ ـ ١٩٩١) لەسەردەمی سیستەمی کۆماری لەعیراقدا کردووە.

ململانێو چارەسەر نەکردنی کێشەی کەرکوک هۆی سەرەکی بەبنبەست گەیشتنی سەرجەم دانوستانەکانی نێوان وەفدی رژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عیراقو بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد بوو لەساڵانی (١٩٢٩- ١٩٣٣ ١٩٤٣- ١٩٧٤- ١٩٨٤- ١٩٩١- )[٣٤] وەك لەهەوڵو داواکانی نوێنەرانو سەرکردایەتی سیاسی کوردا ئەنجامدراوە بەم شێوەیە.

- داخوازیەکانی نوێنەرانی کورد لەئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق بەیاداشتێك لەساڵی ١٩٢٩، بۆ پێکهێنانی یەکەیەکی کارگێری(وحدة ادارية) لەسنوری لیواکانی (سلێمانی ، هەولێر ، کەرکوك)و قەزا کوردیەکانی سنوری لیواکانی (موسڵ، دیالی).

- داخوازیەکانی سەرکردایەتی سیاسی کورد لەساڵی ١٩٤٣ بۆ پێکهێنانی ویلایەتی کوردستان لەلیواکانی (سلێمانی، هەولێر، کەرکوك)و قەزا کوردیەکانی لیواکانی (موسڵ، دیالی)

---

[٣٤] د. خليل اسماعيل محمد. كركوك. دراسات في التكوين القومي للسكان ٢٠٠٢

- داخوازیەکانی سەرکردایەتی سیاسی کورد لەساڵی ١٩٧٤ لەسەر بنەمای ڕێککەوتنامەی ١١ئازاری ساڵی ١٩٧٠، کە کەرکوك ببێتە ناوەندی ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان.

- داخوازیەکانی سەرکردایەتی سیاسی کورد (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) بەخستنەپاڵی پارێزگای کەرکوك بۆ چوارچێوەی سنوری ئۆتۆنۆمی کوردستان لەساڵی ١٩٨٤.

- داخوازیەکانی سەرکردایەتی سیاسی کورد (بەرەی کوردستانی)لەساڵی ١٩٩١. کە کەرکوك لەچوارچێوەی سنوری جوگرافی هەرێمی کوردستاندا بێت.

پاش كۆتايی هاتنی شەڕی درێژخايەنی (عيراق - ئێران) ١٩٨٠ - ١٩٨٨. كە بووە هۆی كوژرانو كەم ئەندامبوونی چەندمليۆن كەسێك لەسوپای هەردوولاو داڕووخانی ژێرخانو دروستبوونی قەيرانی ئابووری عيراق.

دواتر پەلامارو داگيركردنی كوەيت لەلايەن سوپای عيراقەوە لە ١٩٩٠/٨/٢، كە هاوكاتی كۆتايی شەڕی ساردو هەڵوەشانەوەی بلۆكی رۆژهەڵاتو تێكچوونی هاوكێشەی هێزی نێودەوڵەتی بوو. لەو هەلومەرجەدا نەتەوە يەكگرتووەكان لەڕێگەی جێبەجێكردنی سەرجەم بڕيارەكانی ئەنجومەنی ئاسايشەوە (٦٦٠- ٦٦١ - ٦٦٤ - ٦٦٥ - ٦٦٦ - ٦٦٧ - ٦٦٨ - ٦٦٩ - ٦٧٠ - ٦٧٤ - ٦٧٧ - ٦٧٨ - ٦٨٦ - ٦٨٧ - ٦٨٨ - ٦٨٩ - ٦٩٢ - ٦٩٩ - ٧٠٠ - ٧٠٥ - ٧٠٦ - ٧٠٧ - ٧١٢ - ٧١٥)[٣٥]. لەسالانی١٩٩٠ - ١٩٩١ كە بڕياری ئابلوقەی ئابوری بۆ سەر عيراقو كۆدەنگی نێو دەوڵەتی بۆ پێكهێنانی هاوپەيمانی سەربازی بۆ دەستپێكردنی شەڕی دووەمی كەنداو بەئامانجی وێرانكردنی زياتری ژێرخانی ئابووری عيراقو سزادانی سوپای عيراقو ئازادكردنی كوەيت بوون.

پاش جێبەجێكردنی ئەو ئامانجانەو ئازادكردنی كوەيتو گەڕانەوەی سوپای عيراق بەشكست خواردوويی، گەلانی عيراق لەزۆربەی پارێزگاكانی باشوردا خۆپيشاندانيان ئەنجامداو شارو شارۆچكەكانيان لەدەسەڵاتی رژێم ئازاد كرد.

لەكوردستانيشدا بەپێی بەرنامەيەكی داڕێژراو جەماوەرو هێزی پێشمەرگەی كوردستان توانيان سەرجەم شارو شارۆچكەكان لەدەسەڵاتی رژێم ئازاد بكەن بەشاری كەركوكيشەوە، كە بۆ يەكەم جاربوو لەمێژووی

---

٣٥ نجم عمر السورچي . مصيرولاية الموصل (كردستان الجنوبة) ص١٦٤ - ١٧٩

بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردا ئەو ئامانجە بێتە دی، گەر ماوەکەشی زۆر کورت بوو، ئەویش بەهۆی بڕیاری راگرتنی شەڕی دووەمی کەنداو دوای جێبەجێکردنی ئامانجەکانی هێزی هاوپەیمانان لەو چوارچێوەیەدا، کە بۆی دەستنیشان کرابوو، دواتر والآکردنی دەستی رژێم بۆ کپکردنەوەی راپەڕینەکانی جەماوەر بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە لەباشوری عێراق‌و کوردستاندا.

جەماوەری راپەڕیو بە مەبەستی پاراستنی دەستکەوتەکانی راپەڕین، بەرگرییەکی قارەمانانەیان لەبەرانبەر هێزەکانی رژێم ئەنجامدا، بەلآم بەهۆی ناهاوسەنگی تەرازووی هێز لەلایەك‌و نارێکخراوبوونی جەماوەرو نەبوونی بەرنامەی بەرگری لەرووی زانستی سەربازییەوە. رژێم لەرێگەی بەکارهێنانی سەرجەم کەرەستە سەربازییە جۆراو جۆرەکانی‌و تەواوی دام‌و دەزگا داپلۆسێنەرەکانی خۆی، توانی تەواوی شارو شارۆچکەکان لەباشوردا بخاتەوە ژێر دەسەلآتی خۆی پاش وێرانکردنی ناوچەکەو لەناوبردنی ژمارەیەکی زۆری خەلك.

لەم هەلومەرجەدا، لەکوردستان، خالی وەرچەرخانی نوێ لەپیادەکردنی شێوازی نوێی خەبات هاتە کایەوە، ئەویش لەرێگەی دروستبوونی یەك هەلوێستی، کە تەواوی جەماوەری کوردستانی عیراقی خستە هەلوێستی رەزامەند نەبوون بەمانەوە لەژێر دەسەلآتی رژێمدا.

ئەنجامدانی (کۆڕەو)و چۆلکردن‌و بەجێهێشتنی تەواوی شارو شارۆچکەکانی کوردستان بووە هۆی ئاوارە بوونی زیاتر لەسێ ملیۆن مرۆڤی کورد ئاراستە بە سنورەکانی ولآتانی دراوسێ‌و دروستکردنی فشارێکی نوێ لەرووی مرۆڤایەتی‌و نەتەوەییەوە، کە دەرخستنی رەوایی

مافەكانی نەتەوەیی كوردی بۆ تەواوی جیهان راگەیاند. بووە مایەی شكاندنی بێدەنگی سیاسەتی نێودەوڵەتی لەئاست چەوسانەوەو پێشێلكردنی مافەكانی میللەتی كوردو دەرچوونی بڕیاری ٦٨٨ی ئەنجومەنی ئاسایش لە ١٩٩١/٤/٥ كە بڕیاری كۆتایی هێنان بوو بە حەفتا ساڵ بێدەنگی كۆمەڵگای نێودەوڵەتی لەئاست سیاسەتی پاكتاوكردنی كوردو گەیاندنی كێشەكەی بەئاستی نێودەوڵەتیو دروستكردنی ناوچەی (ئاسایش) ئەمنیو دژە فڕین لەهێڵی پانی ٣٦، كە بەشێكی كوردستانی گرتەوە جگە لەپارێزگای كەركوكو ئەو ناوچانەی ئێستا بە ناوچە جێناكۆكەكان ناسراون.[٣٦]

لەپرۆسەی راپەڕینی دووەمی كوردستاندا، توانرا لەماوەیەكی كورتدا سەرجەم شارەكانی (هەولێر ـ سلێمانی ـ دهۆك)و شارۆچكەكانی تری كوردستان جگە لە كەركوكو ئەو ناوچانەی ئێستا بەناوچە جێناكۆكەكان ناسراون، ئازاد بكرێتو لەفەزایەكی نوێی دیموكراسیدا پرۆسەی هەڵبژاردن بەئامانجی پێكهێنانی ئەنجومەنی نیشتمانی كوردستانو دامەزراندنی حكومەتی هەرێمی كوردستان، بەشێوەیەكی ئازادانە ئەنجام بدرێت .

بەم پێیە لەم هەلومەرجە نوێیەی سیاسەتی نێودەوڵەتیشدا ، كەركوكو ناوچە جێناكۆكەكان وەك بەشێكی جیا لە ناوچەكانی تری هەرێمی كوردستان مامەڵەی لەگەڵدا كرا.

سەرجەم بڕیارەكانی ئەنجومەنی ئاسایشو بەردەوام بوونی ئابلوقەی ئابووریو دواتر جێبەجێكردنی بڕیاری ٩٨٦ لە ١٩٩٦/٥/٢٠ (نەوت

---

٣٦ نجم عمر السورجي. مصير ولاية الموصل (كردستان الجنوبية) ص١٧٥

بەرانبەر خۆراك)[٣٧] و بڕیاری ١١١٥ لە ١٩٩٧/٦/٢١ (گەڕانو پشكنین بەدوای چەكی كۆمەڵكوژ) بەمەبەستی سزادانی رژێمی فەرمانڕەوایی عیراق، هۆكاری سەرەكی لاوازبوونی پێگەكانی دەسەلات بوو لەناو خۆو لەدەستدانی شەرعیەتی كۆمەڵگای نێو دەوڵەتی رژێم بوو، تا لەدوانەنجامدا لەژێر دروشمی لەناوبردنی چەكی كۆمەڵكوژی عیراق، بڕیاری دەستپێكردنی شەڕ لە ٢٠٠٣/٣/١٩ و جێبەجێكردنی پرۆسەی ئازادی عیراق لەلایەن هێزی هاوپەیمانانەوە دراو لە ٢٠٠٣/٤/٩ لەئەنجامی سەركەوتنی هێزی هاوپەیمانان، كۆتایی بەدەسەلاتی یەكێك لە درندەترین رژێمەكانی سەدەی رابردوو هاتو گەلانی عیراقی گەیاندە ئایندەیەكی نوێ لە قۆناغێكی نوێی بنیاتنانی ژیانی سیاسیو ئابوریو كۆمەلایەتیدا.

لەو هەلومەرجەشدا دەست نیشانكردنی رۆژی ٢٠٠٣/٣/١٩ لەلایەن هێزی هاوپەیمانان بۆ سنوری دەسەلاتی حكومەتی هەرێمی كوردستانو راگەیاندنی ئالیەتی ساغكردنەوەی چارەنووسی ناوچە جێناكۆكەكان لەرێگەی یاساوە، بەمانای رەتكردنەوەی مێژوویی كوردستانی بوونی ئەو ناوچانەو دووپاتكردنەوەی جیاكردنەوەی ئەو ناوچانەیە لەهەرێمی كوردستان.

لەدەرئەنجامی پیادەكردنی سیاسەتی شۆڤێنانەی رژێمە یەك لەدوای یەكەكانی عیراق لەسەردەمی پاشایەتیو كۆماریدا، كە كەمینەی سوننەی

[٣٧] . نجم عمر السورچي . مصير ولاية الموصل (كردستان الجنوبة ص ١٧٣

عـەرەب بـەهۆی پێگـەی بـەهێزیان لەسـەردەمی دەوڵـەتی عوسمـانیو پاڵپـشتی ئیمپرالیـزم بۆیـان بـە بـاڵا دەسـتی دەرکـەوتو سیاسـەتی بەرگەنارکردنی پێکهاتەکانی تری (نەتەوەیی ـ ئایینی ـ مەزهـەبی)پیـادە دەکرد.

بەدرێـژایی مێـژووی دەوڵـەتی عـیراق، چـەندین هـەوڵی دڵـسۆزانەی پێکهاتـەکان، بەتایبـەتی هـەوڵی دڵـسۆزانەی میللـەتی کـورد هـەبووە، تـا لەرێگـەی دانوسـتانو گفتوگـۆوە کێـشەکانی چارەسـەربکرێتو بیرۆکـەی پێکـەوە ژیـان بنیـات بنرێـت، بـەڵام پیـادەکردنی سیاسـەتی شـۆڤینیانەی رژێمەکان سیمای سەرەکی وەڵامدانەوەی ئەو هەوڵانە بووە.

بەمەبەسـتی بنیاتنانـەوەی بـەردی بناغـەی ئاشـتیو پێکـەوە ژیـانی سـەرجەم پێکهاتـەکانو بیرۆکـەی یەکخـستنی گـەلانی عـیراق، لەلایـەن کەسـایەتیو پـارتو رێکخـراوە سیاسـیەکانی ئۆپۆزسـیۆنی عیراقـی لەکۆنگرەی لەندەندا گەڵاڵە بوو.

# کۆنگرەی لەندەن[٣٨]

[٣٨] لیژنەی هاوبەشی مادەی ١٤٠. مەڵبەندی (٢)ی یەکێتی نیشتمانی کوردستانو لقی (٣)ی پارتی دیموکراتی کوردستان. جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ زامنی ئاشتیو پێکەوە ژیانە.

لەرۆژانی ١٤ـ ١٦ کانونی یەکەمی ٢٠٠٢ لەشاری لەندەنی پایتەختی ئینگلترا کۆنگرەیەك بۆ کەسایەتیو پارتو ڕێکخراوەکانی عیراقی بەسترا، کە هەریەك لە (ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامیو حزبی دەعوەی ئیسلامیو حزبی شیوعی عیراقو پارتی دیموکراتی کوردستانو یەکێتی نیشتمانی کوردستانو ئەحزابی دیکەی عەرەبی سوننەو ... تاد)بەشداربوون.

لەم کۆنگرەیەدا چەندین بڕیارو ڕاسپاردە بۆ دوای ڕوخانی ڕژێمی بەعس، بۆ قۆناغی گواستنەوە گەڵاڵە کراو بڕیاری لەسەردرا، کە لە خاڵی نۆیەمی بڕیارو ڕاسپاردەکانی کۆنگرەکەدا بەناونیشانی (دەربارەی ڕاگواستنو پاکتاوی ڕەگەزیو گۆڕینی باری نەتەوەیی) هاتووە.

(کۆنگرە ئیدانەی ڕاگواستنی زۆرە ملێو پاکتاوی ڕەگەزیو بەکارهێنانی چەکی کیمیاویو گۆڕینی ناسنامەی نەتەوایەتیو هەموو ئەو گۆڕانکاریانە دەکات، کە لەواقعی نەتەوایەتی ناوچەکانی کەرکوكو مەخمورو خانەقینو شەنگارو شێخانو زومارو مەندەلیو ناوچەکانی دیکەدا کراونو کۆنگرە بانگەشەی سڕینەوەی هەموو ئاسەوارەکانی ئەو سیاسەتانە دەکات. بەپێی ئەم میکانیزمە:

١ ـ گەڕانەوەی ڕاگوێزراوەکان بۆ ناوچەکانی خۆیانو گێڕانەوەی ماڵو موڵکەکانیانو قەرەبوو کردنەوەی ئەو زەرەرو زیانانەی پێیان کەوتووە.

٢ ـ گێڕانەوەی هاوردەکان بۆ شوێنی ڕەسەنی خۆیان .

٣ ـ گێڕانەوەی کوردە فەیلیەکانو هەموو ئەو عیراقیانەی بەبیانوی ڕەگەزنامەی ئێرانی ڕاگوێزرابوون بۆ دەرەوەی وڵاتو زامنی وەرگرتنەوەی ناسنامەیان بۆ بکرێتو موڵكوماڵیان بۆ بگێڕدرێتەوەو

قەرەبووی زیانەکانیان بکرێتەوەو چارەنوسی دەستگیرکراوە فەیلیەکان دیاری بکرێت، کە لەساڵی ١٩٨٠ەوە بێ سەرو شوێن کراون.

٤ ـ پووچەڵکردنەوەی هەموو ئەو میکانیزمانەی، کە رژێم لەساڵی ١٩٦٨ ەوە، بەمەبەستی گۆڕینی دیموگرافی ناوچە کوردنشینەکان پەیڕەوی کردبوو.

هەروەها لەم کۆنگرەیەدا پرۆژەیەك بۆ قۆناغی گواستنەوە ئامادەکراو لەخاڵی نۆیەمیدا بەهەمان شێوە باس لەکێشەی ئەم ناوچانە کراوەو چۆنیەتی میکانیزمی چارەسەری کێشەکە دانراوەو بەم شێوەیە هاتووە سەرژمێرییەکی پاكو بێگەردی دانیشتووان ئەنجام بدرێت، پاش لابردنی ئاسەوارەکانی راگواستنو پاکتاوی رەگەزیو مەزهەبیو گۆڕینی باری دیموگرافی کوردستانو ناوچەکانی دیکەی عیراق بەسەرپەرشتی نێودەوڵەتی بەر لەئەنجامدانی هەرهەڵبژاردنێك لەبەر گرنگی سەرژمێری.

## یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عیراق
## بۆ قۆناغی گواستنەوە [٣٩]

دوای پرۆسەی ئازادی عیراقو دامەزراندنی ئەنجومەنی حوکم بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت، کەلە ٢٥ کەسایەتی سیاسی پێکهاتبوون بۆ ماوەی یەك ساڵ. لەو ٢٥ کەسایەتییە ١٢ یان هەڵبژێردران کە هەریەکەیان ماوەی مانگێك سەرۆکایەتی ئەنجومەنەکەیان دەکرد لەماوەی یەك ساڵدا.

- ئەم ئەنجوومەنە، لیژنەیەکیان بۆ نووسینەوەی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت پێکهێنا، کەلەهەموو لایەنە سیاسیەکانی عیراق پێکهاتبوون بە (عەرەب - کورد - تورکمان - کلدان - ئاشور)و مەزهەبە جیاوازەکانیانەوە، ، کەلە ٢٠٠٣/٣/٨ یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عیراق بۆ قۆناغی گواستنەوە راگەیەندرا.

- ئەم یاسا کاتییە لەجیاتی دەستوور بنەمای دەسەڵاتی هەردوو حکومەتەکەی (د. ئەیاد عەلاویو د. ئیبراهیم جەعفەری) بوو لە ٢٠٠٤/٦/٣٠ تا ٢٠٠٥/١٢/٣١ کە لەسەریان بوو رێگە بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانو نوسینەوەی دەستوری هەمیشەییو جێبەجێکردنی مادەی ٥٨ی یاسا کاتیەکە خۆش بکەن.

---

[٣٩] لیژنەی هاوبەشی مادەی ١٤٠. مەلبەندی (٢)ی یەکێتی نیشتمانی کوردستانو لقی (٢)ی پارتی دیموکراتی کوردستان. جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ زامنی ئاشتی وپێکەوە ژیانە

**دەقی مادەی ( ٥٨ )ی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت بۆ قۆناغی گواستنەوە.[٤٠]**

**یەکەم :ـــ** حکومەتی گواستنەوەی عیراق بەتایبەت دەستەی باڵای چارەسەرکردنی کێشەکانی موڵکایەتی، بەپەلە ڕێو شوێن ئەگرنە بەر بۆ لابردنی زوڵمی سیاسەتی ڕاگواستن و دورخستنەوەی خەڵك لەشوێنی نیشتەجێی خۆیان، کە بەهۆی ڕەفتارەکانی ڕژێمی پێشوو ڕوویداوە لەگۆڕینی باری دانیشتوانی ناوچە جیاوازەکان، بەکەرکوکیشەوە.

بۆ نەهێشتنی ئەو زوڵمە، حکومەتی گواستنەوە ئەم هەنگاوانە جێبەجێ دەکات.

أ ـ گەڕانەوەی ڕاگوێزراو دوورخراوو کۆچپێکراوەکان بۆ سەرماڵ و موڵکی خۆیان لەماوەیەکی شیاودا بەگونجان لەگەڵ یاسای دەستەی باڵای چارەسەرکردنی کێشەکانی موڵکایەتی، گەر ئەوەش نەتوانرا پێویستە حکومەت قەرەبوویەکی دادپەروەرانەیان بکات.

ب ـ بەپێی مادەی ١٠ی یاسای دەستەی باڵای چارەسەری کێشەکانی موڵکایەتی، سەبارەت بەو کەسانەی هێنراون بۆ ناوچە دیاریکراوەکان، لەکێشەکەیان بکۆڵێتەوە، بۆ مسۆگەرکردنی سەر لەنوێ نیشتەجێکردنەوەیان لەلایەن دەوڵەتەوە.

ج ـ سەبارەت بەو کەسانەی بێبەش کراون لە دامەزراندن یا لە پێویستیەکانی گوزەران تا ناچاریان بکەن لەزێدی خۆیان کۆچ بکەن و زەویەکانیان بەجێ بهێڵن، پێویستە حکومەت هانی ئەوە بدات دەرفەتی نوێی کاریان لەو ناوچەیەو زەوییان بۆ بڕەخسێنێت.

---

[٤٠] بەڵگەی نامەی ژمارە ١٣ . المادة الثامنة والخمسون من قانون ادارة الدولة للمرحلة الأنتقالية.

د ـ سەبارەت بەگۆڕینی باری نەتـەوەیی (تـصحيح القوميـة)، پێویـستە حکومـەت هـەموو بڕیارەکـانی پەیوەسـت هەڵبوەشـێنێتەوەو ڕێگـە بـدات کەسـانی زیـان لێکـەوتوو بـەبێ زۆر لێکـردنو گوشـار، مـافی خۆیـان لەدیاریکردنی ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان پەیڕەو بکەن.

**دووەم:** ـ ڕژێمـی پێـشوو بەمەبەسـتی بـەدیهێنانی ئامـانجی سیاسـی، دەستکاری سنورە ئیداریەکانی کردووەو گۆڕیویێتی، بۆیە پێویستە لەسـەر ئەنجومـەنی سـەرۆکایەتیو حکومـەتی گواسـتنەوەی عیراقـی راسـپاردە پێـشکەشی کۆمەڵـەی نیـشتمانی بکـەن، لـەپێناو چارەسـەرکردنی ئـەو گۆڕانکارییـە ناڕەوایانـە. گـەر نـەتوانرا پێویـستە ناوبـژیوانێکی بێلایـەن دابمەزرێنێت بـۆ لێکۆڵینـەوە لەکێشەکەو پێشکەشکردنی راسپاردە، گـەر نــەتوانرا لەســەر ناوبــژیوانێك ڕێکبکــەون، ئــەوا پێویــستە ئەنجومــەنی سـەرۆکایەتی داوا لەسـکرتێری گـشتی نەتــەوە یـەکگرتووەکان بکـات، کـە کەسایەتیەکی نێودەوڵەتی ناودار بۆ ئەو ناوبژیوانیە دەستنیشان بکات.

**سێهەم:** ـ چارەسەری یەکجارەکی ناوچە جێناکۆکەکان بەکەرکوکیشەوە دوادەخرێـت بـۆ پـاش جێبـەجێکردنی ڕێـو شـوێنەکانی سـەرەوەو ئەنجامدانی سەرژمێرییەکی عادیلانە.

دوای جێبەجێکردنی پرۆسەی ئازادی عیراقو رووخانی ڕژێمی پێشوو لەنیسانی ٢٠٠٢، بڕیاری پێکهێنانی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك درا، بە لەبەرچاوگرتنی بـاری سـازانـدنی (توافـق) سـەرجەم پێکهاتـەکانی (کـورد، تورکمـان، عــەرەب، کلـدۆ ئاشـور) بەمەبەسـتی ڕێکخـستنی کاروبـاری

پارێزگـاو پڕکردنــەوەی بۆشـاییە یاسـایی‌و ئیدارییــەکان (دەسـەڵاتی یاسادانان‌و جێبەجێکردن).

لەو کاتەدا ئەنجومەن بەشێوەیەکی فەرمی لەم خولەدا کارەکانی خۆی جــێبەجێکرد تــا ئەنجامــدانی هەڵبــژاردنی ئەنجومــەنی پارێزگاکــان لەسەرتاســەری وڵاتـــدا بـــەپارێزگای کەرکوکیـــشەوە لـــە ٢٠٠٥/١/٣٠، بەمەبەسـتی دەستنیـشانکردنی ٤١ نوێنــەر بـۆ ئەنجومــەنی پارێزگـای کەرکوك لەلیستی براوەی بەشداربوو لەو هەڵبژاردنەدا بەم شێوەیە بوو .

- لیستی برایەتی کەرکوك (قائمة كركوك المتأخية)

٢٦ نوێنەر

- لیستی بەرەی تورکمانی (الجبهة التركمانية)

٨ نوێنەر

- لیستی گردبوونەوەی کۆماری (قائمة التجمع الجمهوري)

٥ نوێنەر

ـ لیـستی هاوپـەیمانی ئیـسلامی‌و تورکمـانی (الأئـتلاف الاسـلامي والتركماني) ١ نوێنەر

- لیستی گردبونەوەی نیشتمانی عیراق (التجمع الوطني العراقي)

١ نوێنەر

لــەرۆژی ٢٠٠٥/١٠/١٥، لەسەرتاســەری عیراقــدا راپرســی ئەنجامــدرا، بەمەبەسـتی متمانــەدان بەڕەشنووسـی دەسـتور، کـە بـەپێی راگەیانـدنی (کۆمــسیۆنی بـاڵای سـەربەخۆی هەڵبژاردنــەکان) بەرێــژەی ٧٨٫٤٠٪ی سەرجەمی دەنگدەران، متمانە بەخشرایە رەشنووسی دەستورەکە.

**مادەی ١٤٠ی دەستوری هەمیشەیی عیراق**

ـ لەدوای جێبەجێنەکردنی مادەی (٥٨)لەیاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عیراق بۆ قۆناغی گواستنەوە، سەرکردایەتی سیاسی کورد لەسەرو بەندی دارشتنەوەی دەستوری هەمیشەیی عیراقدا، توانیان مادەی (٥٨)بگوێزنەوەو لەمادەی(١٤٠)ی دەستوردا جێگیری بکەن. کە تێیدا بڕیاری هەرسێ قۆناغی (ئاسایی کردنەوەو سەرژمێریو راپرسی)دراوە.

**دەقی مادەی ١٤٠** [41]

**یەکەم:**

دەسەڵاتی جێبەجێکردن ئەو هەنگاوە پێویستیانە دەگرێتە بەر بۆ جێبەجێکردنی پێداویستیەکانی مادەی (٥٨) بەهەموو بڕگەکانییەوە .

**دووەم:**

ئەو بەرپرسیارێتیەی دەکەوێتە ئەستۆی دەسەلاتی جێبەجێکردن لەحکومەتی ئینتقالیدا کەلەمادەی (٥٨) ی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عیراقدا بۆ قۆناغی گواستنەوە دانراوە، درێژ دەبێتەوەو بەردەوام دەبێت بۆ دەسەلاتی جێبەجێکردن بەپێی ئەم دەستوورە هەڵبژێردراوە، بۆ ئەوەی قۆناغەکانی بەتەواوی ئەنجام بدرێت لەرووی (ئاسایی کردنەوە ـ سەرژمێری ـ راپرسی) لەسەرجەم ناوچە جێناکۆکەکاندا بە

---

[41] الدستور العراقي الدائم

بەڵگەنامە کانی ژمارە: ١٤- ١٥- ١٦ -١٧- ١٨- ١٩ ٢٠ -٢١- ٢٢

کەرکوکیشەوە، لەماوەیەکدا کەلە ۲۰۰۷/۱۲/۳۱ تێپەڕ نەکات بەمەبەستی دیاریکردنی خواستی هاووڵاتیان.

سستی کارەکانی حکومەت لەسەردەمی سەرۆکایەتیکردنی (د. نەیاد عەلاوی ـ د. ئیبراهیم جەعفەری‌و د. نوری المالکی) بۆ جێبەجێکردنی مادەی (٥٨)ی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت‌و ماددەی ١٤٠ی دەستووری عیراق، هۆکاری سەرەکی جێبەجێنەکردنی قۆناغەکانی ئەو مادەیە بوون لەمێژووی دیاریکراوی خۆیدا لە ۲۰۰۷/۱۲/۳۱، کە بووە هۆی دروستبوونی ناکۆکی نێوان پێکهاتەکان لەمانەوەی یاسایی مادەی ١٤٠و نەمانی یاسایی ماوەی مادەکە.

بەمەبەستی چارەسەرکردنی کێشەکە، ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق، لەهەلومەرجێکی نا ئاسایی‌و بەبێ رەچاوکردنی بنەمای سازاندن (مبدأ التوافق)و پاش هەڵوێست وەرگرتنی لیستی هاوپەیمانی کوردستان، لەکۆبوونەوەی رۆژی ۲۰۰۸/۷/۲۲ بڕیاری جێبەجێکردنی مادەی ۲٤ درا کە ناوەڕۆکەکەی بریتی بوو لە:

مادەی ( ٢٤ )ی[٤٢]

## یاسای هەڵبژاردنی پارێزگاکان

**یەکەم:**

دواخستنی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك‌و قەزاو ناحیەکانی، تا کۆتایی هاتنی ئەرکی لیژنەی پێکهاتوو بەپێی بڕگەی چوار لەخوارەوە، بەمەرجێك بڕیارەکانی ئەنجومەن لەمیانەی ئەم دواخستنەدا لەسەر بنەمای سازاندنی (مبدأ التوافق) نێوان پێکهاتە سەرەکیەکانی (عەرەب ـ کورد ـ تورکمان) بێت بەپێی مادەی (٢)ی یاسای ژمارە (١٣)ی ساڵی ٢٠٠٨و مادەی (٧) یاسای پارێزگاکان ژمارە (٢١)ی ساڵی ٢٠٠٨.

**دووەم:**

جێبەجێکردنی دابەشکردنی دەسەڵات لەنێوان سێ پێکهاتە سەرەکیەکە بەڕێژەی ٣٢٪ بۆ هەر یەك لەپێکهاتەی (عەرەب، کورد، تورکمان)و ڕێژەی ٤٪ بۆ کلدۆ ئاشور.

مەبەست لەدەسەڵات سەرجەم فەرمانگە ئەمنی‌و مەدەنیەکان دەگرێتەوە بەسێ پۆستە سیادییەکەش (سەرۆکی ئەنجومەن ـ پارێزگار ـ جێگری پارێزگار)و سەرۆکی لیژنەکانی ئەنجومەن‌و وەزیفە گشتییەکان بەجیاوازی پلەکانەوە.

---

[٤٢] بەڵگەنامەی ژمارە ٢٣

سێههم:

فایلی ئهمنی پارێزگای کهرکوك ئهسپێردرێت بهیهکه سهربازییهکانی هاتوو لهباشورو ناوهڕاستی عیراق لهبری یهکه سهربازییهکانی کارکردوو لهپارێزگاکهو دهرکردنی هێزه ئهمنییهکانی پهیوهست به پارته سیاسییهکان بهمهبهستی دابینکردنی ئازادی کاری لیژنهکه.

چوارهم:

پێکهێنانی لیژنهیهك بۆ جێبهجێکردنی ئهرکی هاتوو لهخاڵی (دووهم)ی سهرهوهو خاڵی (پێنجهم)ی خوارهوه، ڕێژهی ههریهك لهپێکهاته سهرهکیهکان لهو لیژنهیهدا چوار ئهندام دهبێت، که پێویسته دوانیان ئهندامی ئهنجومهنی نوێنهران بن، یهك ئهندامیشی کلدۆ ئاشور دهبێت. بڕیاردان لهم لیژنهیهدا بهزۆرایهتی دهبێت، بهشداری حکومهت لهم لیژنهیهدا بهئهندامان که لهلایهن سهرۆکی حکومهتهوه دهست نیشان دهکرێت که تیایدا نوێنهرایهتی وهزارهتهکانی (بازرگانیو پلاندانانو ناوخۆ) دهکهن بهسهرپهرشتی دوو نوێنهری (نهتهوه یهکگرتووهکانو جامیعهی عهرهبی) که ئهرکیان پێشکهشکردنی پشتگیریو ڕێنماییو ئامۆژگاریو چاودێری کردن دهبێت، ئهم لیژنهیه دهست به ئهنجامدانی ئهرکهکانی دهکات لهڕۆژی ١/١٠/٢٠٠٨هوه.

پێنجهم:

ئهرکهکانی لیژنهکه

١ـ دانانی ئالیهتی دابهشکردنی دهسهڵات بهپێی بڕگهی (٢) سهرهوه.

٢. دەستنیشانکردنی زیادەڕەوی لەسەر موڵکە گشتیو تایبەتییەکانو ڕەوشی دانیشتوانی پارێزگای کەرکوك لەدوای ٢٠٠٣/٤/٩ەوە.

٣ـ بەرزکردنەوەی پێشنیازەکانی لیژنەکە بۆ کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان، بەئامانجی دروستکردنو نوێکردنەوەی تۆماری دەنگدەران بەپێی ئەو ئەنجامانەی کە پێی گەیشتووە.

٤ـ ئەنجامدانی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك دوای بەرزکردنەوەی سەرجەم پێشنیازو ئەنجامەکانی وەدەست هاتوو، بۆ ئەنجومەنی نوێنەران بەمەبەستی دەستنیشانکردنی ڕۆژو نالیەتی جێبەجێکردنی هەڵبژاردن لەلایەن ئەنجومەنی نوێنەرانەوە.

**شەشەم:**

حکومەتی فیدراڵی ئەرکەکانی پاراستنی ئەمنیو تێچوەکانی مادی ئەرکەکانی لیژنەکە دابین دەکات.

**حەوتەم:**

لەکاتی دروستبوونی ئاستەنگ یاخود جێبەجێنەکردنی پێکهێنانی لیژنەکە یاخود جێبەجێنەکردنی بڕیارو پێشنیارەکان، هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك ئەنجام دەدرێت بەرێژەی (١٠) نوێنەر بۆ هەریەك لەپێکهاتە سەرەکییەکانو (٢) نوێنەر بۆ کەمایەتییەکان، لەماوەیەکدا کە تێپەڕنەکات لە ٢٠٠٨/١٢/٣١ کە لەلایەن ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراقەوە دیاری دەکرێت.

دەرچوونی مادەی (٢٤) لەلایەن ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق، نارەزایەتی فراوانی لەلایەن پێکهاتەی کوردی لێکەوتەوە، رەنگدانەوەی ئەم نارەزایەتیەش لەشاری کەرکوکدا بووە هۆی ئەنجامدانی خۆپیشاندانێکی فراوانی جەماوەری هێمنانە لە ٢٠٠٨/٧/٢٨دا ، کە سەرجەم دروشمو داواکاری خۆپیشاندەران، رەتکردنەوەی مادەی (٢٤)و پێشێلنەکردنی مافەکانی میللەتی کوردبوو بە شێوازێکی دیموکراسیو مەدەنیانە لەچوارچێوەیەکی یاساییو دەستووریدا.

ئەم هەڵوێستەی جەماوەریش لەلایەن کەسانو لایەنی گێرە شێوێنەوە بە ئاراستەی توندو تیژیدا براو، بووە هۆی شەهید بوونو برینداربوونی بەشێك لەخۆپیشاندەران.

بەمەبەستی پشتگیری لەداوای خۆپیشاندەران، لەتەواوی شارو شارۆچکەکانی هەرێمی کوردستان خۆپیشاندانی جەماوەری ئەنجام درا.

لەهەمان کاتدا، بەهۆی پێشێلکردنی بنەمای سازاندن (مبدأ التوافق) لە دەرکردنی مادەی (٢٤)دا، لەلایەن ئەنجومەنی سەرۆکایەتی کۆمارەوە (مادەی ٢٤) بە بەکارهێنانی مافی (ڤیتۆ) رەتکرایەوەو دووبارە ئاراستەی ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق کرایەوە، بە ئامانجی دارشتنەوەو دەرچوونی یاسایەکی تر لەسەر بنەمای سازاندن (مبدأ التوافق). سەرەنجامی نارەزایەتی پێکهاتەی کوردو پەسەند نەکردنی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی کۆمار بۆ مادەی (٢٤) لەکۆبوونەوەی ئەنجومەنی نوێنەراندا مادەی (٢٣) جێگەی مادەی (٢٤) گرتەوە، ناوەرۆکی مادەی (٢٣) بریتی بوو لە:

## مادەی ( ٢٣ )ی[٤٣] یاسای هەڵبژاردنی پارێزگاکان

**یەکەم: ـ**

ئەنجامــدانی پرۆســەی هەڵبــژاردن لــەپارێزگای کــەرکوك و قــەزاو ناحیــەکانی، دوای جــێبەجێکردنی دابەشــکردنی دەســەڵاتی کــارگێڕیو ئــەمنیو وەزیفــە گشتییەکان بــە هەرســێ پۆسـتی سـەرۆکی ئەنجومـەنو پارێزگارو جێگری پارێزگارەوە لەنێوان پێکهاتـەکانی پارێزگـای کـەرکوك بەرێــژەی یەکـسان لـەنێوان پێکهاتــە ســەرەکیەکان، پێکهاتــەی زۆرینــە لەئەنجومەنی پارێزگا، سەرپشکە لەدەستنیشانکردنی یەکێك لەبەرزترین ســێ پۆسـتی (پارێزگــار یــاخود جێگــری پارێزگــار یــاخود ســەرۆکی ئەنجومەن).

**دووەم: ـ**

پێکهێنانی لیژنەیەك کە پێکدێت لەدوو نوێنــەر بـۆ هەریـەك لەسـێ پێکهاتــە ســەرەکیەکەی پارێزگــای کــەرکوك، کــە نوێنەرایــەتی پارێزگــای کەرکوك دەکەن لەئەنجومەنی نوێنەرانی عیراقو یەك نوێنەری پێکهاتەی کلدۆ ئاشور لـە ٢٠٠٨/١١/١، ئـەم لیژنەیـە دەتوانێـت پـشت بـەهاوکاری دوو پــسپۆڕ لەهەریــەك لەپێکهاتــەکانو نوێنــەرانی لیــستەکانی پەرلــەمانو

---

[٤٣] بەڵگەنامەی ژمارە ٢٤

وەزارەتـــە پەیوەندیـــدارەکان وەربگریـــت بـــۆ پێـــشکەشکردنی راویـــژو ئامۆژگاری، سەرباری هاوکاری تەکنیکی لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکان.

بڕیارەکانی لیژنەکە لەسـەر بنـەمای سازاندن (مبـدأ التوافـق) دەبێـت، نابێت کاری لیژنەکە دژ بە هیچ مادەیەك لـەمادەکانی دەسـتوری عیراقـی پەیوەندیدار بە کەرکوك بێت.

لیژنەکـەش هەڵدەسـتێت بـە پێـشکەشکردنی راپـۆرتی خـۆی بـۆ ئەنجومەنی نوێنەران سەبارەت بە ئەم کارانە.

أ - ئالیـەتی دابەشـکردنی دەسـەڵات لەکـەرکوك وەك لـەخاڵی (١)ی سەرەوەدا هاتووە.

ب - دەستنیشانکردنی زیادەڕەوی لەسەر موڵکە گشتیو تایبەتییـەکان، لەماوەی (پێش‌و دوای) ٢٠٠٣/٤/٩، حکومەتی عیراق زامنی راستکردنەوەی ئەو زیادەڕەویانە لەعیراقدا دەکات بەپێی یاسای عیراقی.

جـ - پێداچـوونەوەو وردبینیکردنـی سـەرجەم زانیـاریی‌و تۆمارەکـانی پەیوەندیدار بە دانیشتوان بە تۆمـاری دەنگدەرانیـشەوەو پێشکەشکردنی راسپاردەکانی پابەند بە بنەمای سازاندن (مبـدأ التوافـق) بـۆ کۆمـسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان بەپێی ئەنجامی وەدەست هاتوو.

و - لیژنەکە راپۆرتی خۆی پێشکەش بە ئەنجومـەنی نوێنـەران دەکـات لەکاتێکـدا، کـە تێپـەڕ نـەکات لـە ٢٠٠٩/٣/٣١، ئەنجومـەنی نوێنــەران هەڵدەستێت بە بەدواداچوون‌و زامنکردنی کارەکانی لیژنەکە.

**سێیەم:**

هەڵبـژاردنی ئەنجومـەنی پارێزگـای کـەرکوك ئـەنجام دەدرێـت دوای پێـشکەشکردنی راسـپاردەو ئەنجامـە وەدەسـتهاتووەکانی لیژنەکـە بـۆ ئەنجومەنی نوێنەران، بەو پێیەش ئەنجومەنی نوێنەران هەڵدەستێت بـە دارشـتنی یاسـایەکی تایبـەت بـۆ یـەك خـولی هەڵبـژاردنی ئەنجومـەنی پارێزگای کەرکوك.

**چوارەم:**

هـەردوو حکومـەتی فیـدراڵیو کـەرکوك بـە یەکـسانی، دابینکردنـی سـەرجەم پێداویـستییەکانی جێبـەجێکردنی کارەکـانی لیژنەکـە بـەپێی دەستور، دەگرنە ئەستۆ.

**پێنجەم:**

ئەنجومـەنی پارێزگـای کـەرکوك، بـەردەوام دەبێـت لـەپیادەکردنی ئەرکەکانی خۆی بەپێی یاساکانی جێبەجێکردن پێش تەواوبوونی یاسای ژمـارە ٢١ی سـاڵی ٢٠٠٨و بـارودۆخی پارێزگـای کـەرکوك وەك خـۆی دەمێنێتەوە لەرووی دەستورەوە تا کاتی ئەنجامدانی هەڵبژاردن تیایدا.

**شەشەم:**

پیـادەکردنی ئەحکامـەکانی برگـەی (٢)ی مـادەی (٥٥)ی یاسـای ژمـارە (٢١)ی ساڵی ٢٠٠٨، لەئەنجومەنەکانی پارێزگای کەرکوك.

حەوتەم:

لەکاتی دروستبوونی ناستەنگ بۆ لیژنەکە لە پێشکەشکردنی راسپاردەکانی بۆ ئەنجومەنی نوێنەران، ئەنجومەن یاسایەکی تایبەت بە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك دادەڕێژێت، لەدروستبوونی ناستەنگ لەم حاڵەتەشدا هەرسێ سەرۆکایەتی (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی کۆمارو سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانو سەرۆکایەتی ئەنجومەنی نوێنەران) بەهاوکاری نێودەوڵەتی لەڕێگەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، دەستنیشان دەکەن. مەرجی گونجاو بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردن لەکەرکوك.

فشاری پێکهاتەی کورد لەڕووی سیاسیو جەماوەرییەوە، لەڕێگەی هەوڵەکانی سەرکردایەتی سیاسی کورد لەبەغداو کوردستانو هەڵویستی یەکگرتووی لیستی هاوپەیمانی کوردستان لەئەنجومەنی نوێنەرانو ئەنجامدانی خۆپیشاندانی هێمنانەی جەماوەری سەرجەم ناوچە جێناکۆکەکانو شاروشارۆچکەکانی هەرێمی کوردستان هۆکاری سەرەکی جێگرتنەوەی مادەی(٢٣) بوو بەمادەی(٢٤).

بەم پێیە مادەی (٢٣)ی یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان، پێویست بوو لیژنەی پێکهاتوو بەپێی برگەی (٢)ی مادەی ئاماژە پێکراو، لە٢٠٠٨/١١/١ دەست بەکاربوایە بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی، دواتر ئامادەکردنی راپۆرتو بەرزکردنەوەی بۆ ئەنجومەنی نوێنەران لە ٢٠٠٩/٣/٣١.

بەڵام بەهۆی دواکەوتنی دەستبەکاربوونی لیژنەکە، ماوەی کارکردنی درێژکرایەوە بۆ ٢٠٠٩/٦/١. دوای چوارمانگ گفتوگۆو کۆبوونەوەی

لیژنەکە، هەر لەخاڵی یەکەمی کارەکەیاندا نەگەیشتنە هیچ ڕێکەوتنێکی دیاریکراو. بەهۆی جیاوازی بۆچوونی پێکهاتەکانی ئەندامانی لیژنەی مادەی(٢٣)، لەم کاتەشدا گەر پەرلەمان بڕیار لەسەر درێژکردنەوەی وادەی کاری لیژنەکە نەدات، ئەوکاتە پێویستە بەپێی بڕگەی (٧) لەیاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان، مەسەلەکە بگەڕێتەوە پەرلەمانو یاسایەکی تایبەت دابنرێت بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردن لە کەرکوك، گەر لەم هەنگاوەشدا پەرلەمان سەرکەوتوو نەبوو، ئەوکاتە دەخرێتە بەردەستی هەرسێ دەستەی سەرۆکایەتی (سەرۆکایەتی کۆمار ، سەرۆکایەتی پەرلەمان، سەرۆکایەتی وەزیران)و بەهاوکاری نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ داڕشتنی یاسایەکی تایبەت بەهەڵبژاردن لەپارێزگای کەرکوك.

سەرەڕای جەختکردنەوەی بەردەوام لەلایەن سیاسەتی (عیراقیو ئقلیمیو نێودەوڵەتی) یەوە، کە پێویستە کێشەی ناوچە جێناکۆکەکان بەتایبەت کێشەی کەرکوك وەك کێشەیەکی ناوخۆیی عیراق مامەڵەی لەگەڵدا بکرێتو زەمینەسازی چارەسەری کێشەکەش لەو چوارچێوەیەدا ئەنجامبدرێت بە لەبەرچاوگرتنی مافی سەرجەم پێکهاتەکان. بەڵام لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتی عیراقو لکاندنی کوردستانی باشوور بەو دەوڵەتەوە، لەسەرجەم هەڵو مەرجە جیاجیاکانی مێژوودا بۆ ساغ کردنەوەی کێشەی کەرکوك لەنێوان حکومەتی ناوەندو نوێنەرانی کوردا، سیاسەتی ئقلیمی یاخود سیاسەتی نێودەوڵەتی رۆڵی بەرچاوو تا رادەیەك بڕیاردەریان هەبووە، چ لەڕووی هێشتنەوەی کێشەکە بەهەڵپەسێردراوی یاخود ئاڕاستەکردنی بە ئاقارێکدا بەقازانجی حکومەتی ناوەند بەبێ لەبەرچاوگرتنی پاراستنی مافی پێکهاتەی کورد لەو ناوچانەو دابڕینیان لەسنوری جوگرافی هەرێمی کوردستان.

ڕۆڵی بەرچاوی سیاسەتی (ئقلیمیو نێودەوڵەتی) لەئاست پێشێلکردنی داخوازیەکانی میللەتی کورد بەگشتیو کەرکوكو ناوچە جێناکۆکەکان بەتایبەتی، لەسەردەمە جیاوازەکانی دەوڵەتی عیراقیدا (سەردەمی ئینتدابی بەریتانی ، سەردەمی سیستەمی پاشایەتی، سەردەمی سیستەمی کۆماری) لەساڵەکانی (١٩٢٣- ١٩٤٤- ١٩٧٤- ١٩٧٥- ١٩٨٤- ١٩٩١) رەنگی داوەتەوە.

لەدوای پرۆسەی ئازادی عیراقیشدا لەساڵی ٢٠٠٣، دەستنیشانکردنی رۆژی ٢٠٠٩/٢/١٩ لەلایەن هێزی هاوپەیمانان بۆ سنوری حکومەتی هەرێمی کوردستانو رۆڵی سیاسەتی نێودەوڵەتی لەئاست پرسەکانی دەوڵەتی نوێی عیراقدا لەسەرجەم بوارەکانی (سیاسی دەستوری، یاسایی،

پەیوەنـدی ئقلیمـیو نیودەوڵـەتی، نـاوخۆیی، ئـەمنی، ئـابوری .....)، کـە گرنگترینیان بڕیاری ١٧٧٠ [٤٤] ئەنجومـەنی ئاسایـشە لـە ٨/١٠/ ٢٠٠٧ دا کـە تیایدا سەرباری ئاماژەکردن بەسەرجەم بڕیارەکانی (١٥٠٠ لـە ٢٠٠٣/٨/٤و ١٥٤٦ لـە ٨/٦/ ٢٠٠٤و ١٥٥٧ لـە ٨/١٢/ ٢٠٠٤ و ١٦١٩ لـە ٨/١١/ ٢٠٠٥ و ١٧٠٠ لـە ١٠/ ٨/ ٢٠٠٦) دووبـارە جـەخت لەسـەربەخۆییو سـەروەری یەکپارچـەیی عیراقو سەقامگیریو گرنگی پاراستنی ئەمنی عـیراق بـۆ گـەلانی عـیراقو ناوچەکەو کۆمەڵگای نێو دەوڵەتیو پێویستی دوورکەوتنەوە لەدەمارگیری تـایفیو بەشـداری سـەرجەم پێکهاتـەکان لەپرۆسـەو دیـالۆگی سیاسـیو ئاشــتبوونەوەی نیــشتمانیو گرنگــی رۆڵــی نەتــەوە یــەکگرتووەکان لەپێـشکەشکردنی هاوکـاری بـۆ عێـرقو پاڵپـشتی تواناکـانی حکومـەتی عیراقـی بـۆ پتـەوکردنی دەزگاکـانی. بـەمانای دەسـتیۆەردانو کـەمگرتنی سەروەری عیراقە.

لەبەرانبەریــشدا داواکـــاری حکومـــەتی عـــیراق ئاراســـتە بـــە نەتەوەیەکگرتووەکان بەمەبەستی پێشکەشکردنی هاوکاری بـۆ بنیاتنـانی وڵاتێکـی بەرهـەمهێنو گەشـەکردوو وەك لەنامـەی رۆژی ٢٠٠٧/٨/٦ ی وەزیری دەرەوەی عیراق ئاراستە بەسکرتێری گشتی نەتەوەدیەکگرتووەکان کەتیایـدا داوای درێژکردنـەوەی مۆڵـەتی مانـەوەی نەتەوەیـەکگرتووەکان، پێشکەشکردنی راوێـژو هاوکـاری بـەئامانجی وەدیهێنـانی (ئاشـتبوونەوەی نیشتمانی ئەنجامدانی هەڵبژاردنو ریفراندۆم ، پێداچوونە بە دەستوور، چارەسـەرکردنی کێـشەی ناوچـە جێناکۆکـەکان، ئەنجامـدانی سـەرژمێری

[٤٤] بەڵگە نامەی ژمارە ٢٥

دانیشتوان ، رێکخستنی پەیوەندی لەگەڵ وولاتانی کۆمەك بەخش...)
بەمانای رەزامەندی حکومەتی ناوەندە بۆ ئەو جۆرە دەستێوەردانانە.[٤٥]

## راپورتی گروپی دیراسەکردنی عیراق[٤٦]
## بەسەرۆکایەتی ( جێمس بیکەر و لی هاملتون )

راپۆرتی گروپی دیراسەکردنی عیراق، کە ناسراوە بە راپورتی(بیکەر- هاملتۆن). پێکهاتەی ئەم گروپە بریتین لە:

| | |
|---|---|
| جێمس بیکەر | سەرۆکی هاوبەش |
| لی هاملتون | سەرۆکی هاوبەش |
| لورانس ئیگلیبیرگەر | ئەندام |
| ڤیرتۆن جوردەن | ئەندام |
| ساندرا دەی ئۆکۆنەر | ئەندام |
| لیۆن ئی پانیتا | ئەندام |
| ولیەم جەی پێری | ئەندام |
| چارلس ئێس رۆب | ئەندام |
| ئالان سیمپسۆن | ئەندام |
| ئیدوین میسی | ئەندام |

---

[٤٥] بەلگەنامەی ژمارە ٢٥

[٤٦] وەرگێرانی. جەمیل عەلی ـ دانا حەمید ـ عەزیز رەئوف. راپۆرتی دیراسەکردنی عێراق. ((بیکەر ـ هاملتۆن)) چاپی یەکەم ٢٠٠٧

راپورتی ئەم گروپەش شێوازێکی تری دەستێوەردانو هاتنەناوەوەی سیاسەتی نێودەوڵەتی یە لەئاراستەکردنی ئایندەی عیراق، بە بیانوی مەترسیداری بارودۆخی عیراق، لەڕاپۆرتەکەدا ٧٩ راسپاردە لەئەنجامی هەڵسەنگاندنی بارودۆخی عیراق پێشکەشدەکات، لەسەرجەم بوارەکانی (ئاسایش، سوپای عیراق، پۆلسیی عیراق، دەزگاکانی پاراستنی دامەزراوەکان، سیاسەت، ئابووری، کەرتی نەوت ، پشتگیری نێودەوڵەتی، ولآتانی دراوسێ ....) بەمەبەستی وەدیهێنانی ئامانجەکانی ئەمریکا لەعیراقو ناوچەکەدا.

بەگشتی لەراپۆرتەکەدا هەڵوێستێکی باشی سەبارەت بەپرسی سیاسی گەلی کوردستانی تیادا بەدی ناکرێت، لەخاڵی دووی راسپاردەکاندا جەخت لەسەر هەڵمەتێکی دیبلۆماتی هەرێمایەتی دەکات بەئامانجی پشتیوانیکردن لەیەکێتیو یەکپارچەیی عیراقو دەستگیرۆیکردنی عیراق بۆ گەیشتن بەرێکەوتنێکی فرەلایەنو قبوڵ کراو لەسەر کەرکوك، بەهەمان شێوە لەخاڵی ٣٠ راسپاردەکاندا بارودۆخی کەرکوك بەمەترسیدار پێناسە دەکاتو چارەسەرێکی نێودەوڵەتی بەپێویست دەزانێت، کە ئەمیش شێوازێکی تری کاریگەری سیاسەتی نێودەوڵەتیو دەستێوەردانە لەکێشە ناوخۆییەکانی عیراقو پێشێلکردنی سەروەری عیراقو رەتکردنەوەی مادەی ١٤٠ دەستوری عیراقە.

## نەتەوە یەکگرتووەکان و
## چارەنووسی ناوچە جێناکۆکەکان

نوێنــەری تایبــەتی سـکرتێری گـشتی نەتەوەیــەکگرتووەکان(سـتیڤان دیمـستورا) لەچوارچێوەی جێبـەجێکردنی بڕیـاری ئەنجومـەنی ئاسایـشی ژمـارە ١٧٧٠ لـە١٠/ ٨/ ٢٠٠٧ بەمەبەسـتی هاوکـاریکردن بـۆ چارەسـەری کێـشەی ناوچـە دابڕاوەکـانی کوردسـتان چـەند پێـشنیازێك پێـشکەش دەکاتت، لەسێ قۆناغدا.

- قۆنـاغی یەکـەم تایبــەت دەبێـت بەناوچـەکانی (مـەخمور، ئـاکرێ، مەندەلی، حەمدانیە).
- قۆناغی دووەم تایبەت دەبێت بەناوچەکانی (تەلە عفـەر، تـەلکیف، شێخان ، شەنگار، خانەقین)
- قۆناغی سێیەم تایبەت دەبێت بەپارێزگای کەرکوك.
- لەگەڵ ئەوەشدا نەتەوەیەکگرتووەکان جەخت دەکاتەوە، کە کـاری نێردراوی نەتەوەیـەکگرتووەکان پێـشکەشکردنی هاوکـاری‌و ئامـادەکردنی راپۆرتی شیکارییە سەبارەت ناوچەجێناکۆکەکان‌و حکومەتی عیراق خۆی خاوەن بڕیارە لەمیتۆدو پرۆسەی چارەسەرکردنی کێشەکە.

بــەڵام لـــەدوو تـــوێی راپۆرتەکانـــدا شـــێوازێك لەدەســـتێوەردانی نەتەودیەکگرتووەکان بەدیـدەکرێت‌و پێـشێلکردنی مافـە دەستوورییەکانی عیراق لەخۆدەگرێت بەهەنگاوی دوورکەوتنەوە لەمادەی ١٤٠.

ناوچـه جێناکۆکـەکان، بـەو ناوچـانەی هـەرێمی کوردسـتانی عـێراق دەوترێت، کە ئەمرۆ لەدەرەوەی سنوری جوگرافی هەرێمی کوردستاندایە، کە بریتین لەشارو شارۆچکەکانی (کـەرکوك ، خانـەقین ، دووز ، داقـوق ، مەندەلی ، جەلەولا ، پردێ ، قەرەتەپە، دوبز، مەخمو، سەرگەڕان، شێخان، شەنگار .....) کە ناوچەیەکی فراوانە لەڕووبەری هەرێمی کوردستان .

ئەم ناوچانە بەشێوەیەکی بەردەوام، کێشەی سەرەکیو ململانێی نێوان کوردو رژێمەکانی عیراق بووە، جێبەجێکردنی سیاسەتی پاکتاوی رەگەزی مایەی زیاتر ئاڵۆزبوونی کێشەکە بووە. پاش راپەڕینی جەماوەری عـێراق لەساڵی ١٩٩١و دواتر کشانەوەی دەسەڵاتی رژێم لەسنوری ناوچەکانی هێڵی پانی ٣٦، سەرکردایەتی سیاسی کورد بەمەبەستی پڕکردنـەوەی بۆشـاییو رێکخـستنەوەی بـواری کـارگێری، هـەردوو دەسـەڵاتی (یاسـادانانو جێبـەجێکردن)ی لەڕێگـەی ئەنجامـدانی پرۆسـەی هەڵبـژاردنی ئـازادەوە، پێکهێنا.

ئامـانج لـەم هـەنگاوەدا، سـەرباری رێکخـستنەوەی سـەرجەم بوارەکـانی ژیانی ئەم ناوچانە، نیشاندانی سیستەمێکی نـوێی حـوکمڕانی جیـاوازبوو لەسیستەمەکانی حوکمڕانی عیراقو ئامادە باشی بۆ هەلومەرجی داهـاتوو لەپێناو عیراقێکی نوێو دیموکراسی، کە تیایدا زامنی گەڕانەوەی تـەواوی ناوچە جێناکۆکەکان بکرێت بۆ سەر هەرێمی کوردسـتان، ئـەم ئامانجـەش لەچوارچێوەی هاوپەیمانی کـورد لەگـەڵ تـەواوی نۆپۆزیـسیۆنی عیراقـیو خۆگونجاندن لەگەڵ سیاسەتی نیۆدەوڵەتیدا بەدەیهێنرێت.

## ناوچە جێناكۆكەكان و
## دەسەڵاتی كوردی

لەهەرێمی كوردستانی عیراقدا، لەدەرئەنجامی پرۆسەی هەڵبژاردن لەرۆژی ١٩/ ٥/ ١٩٩٢،[٤٧] هەردوو دەسەڵاتی ئەنجومەنی نیشتمانیو حكومەتی هەرێمی كوردستان هاتەكایەوە. ئەنجومەنی نیشتمانی كوردستان لەدانیشتنی رۆژی ٢٢/٧/ ١٩٩٢ دا بەرنامەی حكومەتی هەرێمی كوردستانی پەسەندكرد، كە لە١٣ خاڵ پێكهاتبوو بریتیبوون لە:

١- لەسەر ئاستی سیاسی.
٢- لەسەرئاستی ئازادیو دیموكراسیو مافی مرۆڤ.
٣- لەسەر ئاستی پێشمەرگە.
٤- لەسەر ئاستی بەرێوەبردنو ئاسایش.
٥- لەسەر ئاستی ئابوری.
٦- لەسەر ئاستی یارمەتی مرۆڤایەتیو هاوكاری.
٧- لەسەر ئاستی ئاوەدانكردنەوە.
٨- لەسەر ئاستی پەروەردەو فێركردنو خوێندنی باڵا.
٩- لەسەر ئاستی كشتوكاڵ.
١٠- لەسەر ئاستی تەندروستیو كۆمەڵایەتی.
١١- لەسەر ئاستی گواستنەوەو گەیاندن.
١٢- لەسەر ئاستی رۆشنبیری.
١٣- لەسەر ئاستی كاروباری ئایینی.

---

[٤٧] أنتخابات كردستان العراق في ١٩ مايس ١٩٩٢ تجربة ديمقراطية منشورات مكتب الدراسات والبحوث المركزي في الحزب الديمقراطي الكردستانص٧٠

لەرۆژی ١٩٩٢/١٠/٤، ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان، فیدرالی وەك سیستەمێکی سیاسی لەهەرێمی کوردستان لەچوارچێوەی عیراقدا راگەیاند.[٤٨] لەهەلومەرجێکی دژواردا، لەژێر کاریگەری دوو جۆر ئابلۆقەی ئابوری لەسەر هەرێمی کوردستان.

١- بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایش بەسەپاندنی ئابلۆقەی ئابوری لەسەر عیراق.

٢- سەپاندنی ئابلۆقەی ئابوری رژێمی عیراقی لەسەر هەرێمی کوردستان.

بەمەبەستی رووبوونەوەی ئەو هەلومەرجە، بەهەماهەنگی کۆمەلانی خەلکی کوردستان، کارکردنی دەسەلاتی کوردی بەپێی بەرنامەی ئامازە پێکراو، وەك ئەزمونێکی نوێ لەسەر ئاستی جیهانیو ئقلیمیو عیراقیو کوردستانیدا هاتە ئاراوەو کەوتە بەرانبەر پرسێکی مێژوویی هەستیار لەبەدیهێنانی ئامانجە نیشتمانیو نەتەوەییەکانو تەواوی هەولە دیبلۆماسیەکانی خۆی خستەگەڕ بەمەبەستی ناساندنی کێشەی میللەتی کورد بەجیهانو هەولدان بۆ گۆڕینی روانگەی کۆمەلگای نیودەولەتی بۆ کێشەی میللەتی کورد لەئاستی روانینی مرۆڤانەوە (الحالة الأنسانية) بۆ ئاستی سیاسی (الحالة السياسية).

بەهۆی دەستێوەردانی حزبی لەکاروباری حکومەتو هەولی حزبەکان بۆ بەهێزکردنی پێگەی خۆیان لەنێو دامودەزگا حکومیەکاندا، ململانێی توند لەنێوان حزبەکاندا دروستبوو، بووە هۆی قولبوونەوەی کێشەی

---

[٤٨] الدكتورة. كردستان سالم سعيد. أثر التعددية الأثنية على الوحدة الوطنية في العراق. السليمانية ٢٠٠٨

ناوخۆیی‌و له‌ده‌رئه‌نجامدا شه‌ڕی ناوخۆیی هێزه‌ سیاسییه‌كان سه‌رتاپای هه‌رێمی كوردستانی گرته‌وه‌.

رژێمی عیراقی‌و ولاَتانی ئقلیمی، به‌مه‌به‌ستی لاوازكردن‌و له‌ناوبردنی ئه‌زموونی هه‌رێمی كوردستانی عیراق، به‌رده‌وام له‌هه‌وڵی قوڵبونه‌وه‌ی كێشه‌كان‌و راگرتنی هاوسه‌نگی لاوازی هێزه‌ سیاسییه‌ چه‌كداریه‌ كوردیه‌كاندا بوون.

به‌رده‌وام بوونی شه‌ڕی ناوخۆیی له‌لایه‌ك، بووه‌ هۆی قوربانیدانی چه‌ندین هه‌زار مرۆڤی كوردو به‌هه‌ده‌ردانی سامانی نه‌ته‌وه‌یی‌و دروستبوونی هه‌لومه‌رجی ئابوری قورس له‌سه‌ر بژێوی ژیانی هاوولاَتیان‌و فراوانبونی پانتایی نیگه‌رانی و له‌ده‌ستدانی متمانه‌ی كۆمه‌لاَنی خه‌ڵك بۆ هێزه‌ سیاسییه‌كان، له‌لا یه‌كیتره‌وه‌، بووه‌ به‌هۆی لاوازبوونی هاوسۆزی رای گشتی كۆمه‌ڵگای نیۆده‌وڵه‌تی له‌سه‌ر كورد.

له‌ژێر فشاری كۆمه‌لاَنی خه‌ڵكی كوردستان‌و هه‌وڵی دڵسۆزانه‌ی دۆستانی میلله‌تی كورد، له‌ڕۆژی ١٩٩٦/١٠/٢٣ بڕیاری راگرتنی شه‌ڕی ناوخۆ دراو، له‌هه‌رێمی كوردستاندا دوو ده‌سه‌لاَتی كوردی هاته‌ كایه‌وه‌و بووه‌ هۆی دابه‌شبوونێكی تری سنوری جوگرافی هه‌رێمی كوردستانی عیراق‌و كۆمه‌لاَنی خه‌ڵكی كوردستان.

به‌هۆی ناكۆكی ناوخۆی ده‌سه‌لاَتی كوردی‌و دووركه‌وتنه‌وه‌ له‌ئامانجه‌ نیشتمانی‌و نه‌ته‌وه‌ییه‌كان‌و پیاده‌كردنی سیاسه‌تی نادیموكراسیانه‌و ئاواره‌بوونی هاوولاَتیان له‌ناوچه‌كانی هه‌رێمی كوردستان، كه‌ راسته‌وخۆ كاردانه‌وه‌ی خراپی كرده‌ سه‌ر هه‌ستی نه‌ته‌وایه‌تی پێكهاته‌ی كورد له‌ناوچه‌ جێناكۆكه‌كان.

هەوڵـەکانی ئاشـتی لـەناوخۆو دەرەوە بـەردەوام بـوو، تـا لـەرۆژی ١٩٩٨/٩/١٧ لەوڵاتــە یــەکگرتوەکانی ئــەمریکاو بــە چـاودێری وەزیــری دەرەوەی ئەو وڵاتە، بڕیاری ڕێکەوتن لەنێوان هـەردوو دەسـەڵاتی کـوردی واژوکـرا، کـە بـەپێی بەنـدەکانی ڕێکەوتنامەکـە بڕیـاری یەکگرتنـەوەی هـەردوو دەسـەڵاتی کـوردی‌و ئاسـایکردنەوەی پەیوەنـدی هـەردوو لادرا، بـەڵام جێبـەجێکردنی بەنـدەکانی ڕێکەوتنامەکـە لەپرۆسـەیەکی مـاوە درێژو سستدا کارەکانی خۆی بەئەنجام نەگەیاند.

یەکــــەم هـــەنگاوی کردەیـــی (الخطــوة العمليــة)لــــە ٢٠٠٢/٦/٤ جێبـەجێکرا،[٤٩] کـەبۆ یەکـەمجار لـەدوای شـەڕی نـاوخۆ، ئەنجومـەنی نیشتمانی کوردستان بەئامادە بوونی سەرجەم ئەندامان کۆبونەوەی خۆی ئەنجامدا لەژێر کاریگەری‌و ئامادە باشی بەرنامەی هێزی هاوپەیمانان بـۆ روخانی رژێمی عیراقی.

---

[٤٩] هەمان سەرچاوە لـ٢١٤

## ناوچە جێناكۆكەكان‌و

## حكومەتەكانی سەردەمی عیراقی نوێ( پاش پرۆسەی ئازادی )

پاش رووخانی رژێمی بەعس، لەلایەن هێزی هاوپەیمانان لە ٢٠٠٣/٤/٩. یەكەم دەسەڵات بۆ بەڕێوەبردنی كاروباری عیراق، كە بەپێی یاساكانی جەنگ‌و داگیركردنی سەربازی، پەسەندكراو لەلایەن رێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكانەوە،دەسلاتی هاوپەیمانان (سلطة الأئتلاف) خاوەنی تەواوی دەسەڵاتەكان بوو لەعیراقدا، كە پۆل بریمەر وەك حاكمی مەدەنی سەرۆكایەتی دەكرد. ئەم دەسەڵاتە (دەسەڵاتی هاوپەیمانان)، رۆژی ٢٠٠٣/٢/١٩ی بەدەستنیشانكردنی سنوری جوگرافی دەسەڵاتی حكومەتی هەرێمی كوردستان داناو چارەنووسی ناوچەجێناكۆكەكانی بەهەڵپەسێردراوی هێشتەوە.

لەرۆژی ٢٠٠٣/٧/٢٢دا بڕیاری پێكهێنانی ئەنجومەنی حوكم (مجلس الحكم) درا، كورد بەشداری‌و رۆڵی بەرچاوی لەكۆكردنەوەی هێزولایەنە سیاسییە ناكۆكەكان‌و لەدروستكردنی ئەم ئەنجومەنەدا بینی، جگە لەلایەنی كوردی، هێزو لایەنە سیاسییەكانی تری بەشداربوو لەم ئەنجومە لاوازو كاریگەری ئەوتۆیان لەسەر گەلانی عیراقدا نەبوو.

ئەم ئەنجومەنە لە ٢٥ كەسایەتی پێكهاتبوو لەتەواوی پێكهاتە نەتەوەیی‌و ئایینی و مەزهەبییەكانی) عیراق، ماوەی دەسەڵاتی كاركردنی ئەم ئەنجومەنە بۆ یەك ساڵ بوو، ١٢ كەسایەتی لەئەندامانی (ئەنجومەنی حوكم) دەستنیشانكران بۆ سەرۆكایەتی ئەنجومەنەكە، هەر یەك ئەندام بۆ ماوەی مانگێك سەرۆكایەتی دەكرد.

لەسەردەمی دەسەڵاتی (ئەنجومەنی حوکم)دا، رەزامەندی لەسەر دەستوری کاتی (یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت) بۆ قۆناغی گواستنەوە درا، کە لە٦٢ مادە پێکهاتبوو. [٥٠] بەپێی مادەی (٥٣)ی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت، رۆژی ٢٠٠٣/٣/١٩ بۆ دەستنیشانکردنی سنوری حکومەتی هەرێمی کوردستان جێگیرکراو، هەموو ناوچە کوردیەکانی تر بەناوچەی جێناکۆك (المنطقة المتنازع عليها) دانراو، جەختکرایەوە لەسەر مانەوەی سنوری ١٨ پارێزگاکەی عیراق وەك خۆی لەماوەی قۆناغی گواستنەوەدا.

بەپێی مادەی (٥٨)ی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت، چارەنوسی ناوچە جێناکۆکەکان پەیوەستکرا بە ئەنجامدانی سەرژمێریەکی نادیارو راپرسیەکی ناڕۆشن.

لەڕۆژی ٢٠٠٤/٦/٨ لەلایەن ئەنجومەنی ئاسایشەوە بڕیاری ژمارە ١٥٤٦ دەرکرا، بەمەبەستی ئازادبوونی عیراق بەشێوەیەکی فەرمی لەژێر چەتری داگیرکاریو پێدانی شەرعیەت بەمانەوەی هێزی هاوپەیمانانو رۆژی ٢٠٠٤/٦/٣٠ دەستنیشانکرا بۆ وەرگرتنی تەواوی لێپرسراوێتیو دەسەڵات لەلایەن حکومەتی عیراقی کاتی( بەسەرۆکایەتی د.ئەیاد عەلاوی) ، جەختکردنەوە لەسەر وەرنەگرتنی هیچ بڕیارێك کە کاریگەری لەسەر چارەنوسی عیراقدا هەبێت لەقۆناغی گواستنەوەدا، لەم قۆناغەشدا حکومەتی کاتی عیراق، هیچ هەنگاوێکی کردەیی لەجێبەجێکردنی مادەی (٥٨) دا نەنا، کەتایبەت بوو بەناوچەجێناکۆکەکان.

---

[٥٠] قانون ادارة الدولة العراقية للمرحلة الأنتقالية. المادة الثالثة والخمسون

بەپێی بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایش، پرۆسەی هەڵبژاردن لە ٣١/ ١/ ٢٠٠٥ ئەنجامدرا[٥١] و ئەنجومەنی نیشتمانیو حکومەتی عیراقی بۆ قۆناغی گواستنەوە کە د. ئیبراهیم جەعفەری سەرۆکایەتی حکومەتەکەی دەکرد، پێکهێنا.

هەنگاوەکانی حکومەت لەم قۆناغەدا، پێکهێنانی لیژنەیەك بوو لە(٥٥) ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانی عیراق، لەسەرجەم لایەنە سیاسییەکان. ململانێی توندلە نێوان لایەنە سیاسییەکان لەسەر ناوەڕۆکی کۆتایی مادەکانی رەشنوسی دەستورەکە دروستبوو، بەتایبەت لەسەر (ساغکردنەوەی ناسنامەی عیراق، فیدرالیزم، دابەشکردنی سامان، چارەنوسی کەرکوك).

بەم پییە رەشنووسی دەستور ئامادەکرا، لەڕۆژی ١٥/١٠/ ٢٠٠٥ [٥٢] راپرسی لەسەر رەشنووسی دەستور لەتەواوی عیراقدا ئەنجامدراو بەزۆرینەی دەنگ ٧٨,٤٠٪ سەرکەوتنی بەدەستهێناو مادەی (٥٨)ی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت گوێزرایەوەو بوو بەیەکێك لەمادەکانی دەستوری هەمیشەیی عیراق لەژێر ناوی مادەی (١٤٠).

لەم قۆناغەشدا حکومەتی د.ئیبراهیم جەعفەری هیچ هەنگاوێکی بۆ جێبەجێکردنی مادەی (٥٨) نەنا.

---

٥١ الدكتورة: كردستان سالم سعيد. أثرالتعددية الاثنية على الوحدة الوطنية العراق السلميانية ٢٠٠٨ ص١٢٨

٥٢ الدكتورة. كردستان سالم سعيد. أثرالتعددية الأثنية على الوحدة الوطنية في العراق السليمانية ٢٠٠٨ص ١٢٨

بەسەرپەرشتی کۆمیسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان، لەرۆژی ١٥/ ١٢/ ٢٠٠٥پرۆسەی هەڵبژاردن لەسەرتاسەری عیراقدا ئەنجامدرا، بەمەبەستی دامەزراندنی حکومەتێکی نیشتمانی بۆ ماوەی چوار ساڵ.

ڕاگەیاندنی ئەنجامی هەڵبژاردنەکان لەلایەن (کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان)، کە تیایدا دەستنیشانکردنی ٢٧٥ نوێنەر بۆ ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق لەلیستی براوەی بەشداربوو لەو هەڵبژاردنەدا بەم شێوەیە بوو: [٥٣]

- هاوپەیمانی یەکگرتووی عیراق (الأئتلاف العراق الموحد) ١٢٨ نوێنەر
- هاوپەیمانی کوردستان (التحالف الكردستاني) ٥٣ نوێنەر
- بەرەی سازاندنی عیراق (جبهه التوافق العراقية) ٤٤ نوێنەر
- لیستی نیشتمانی عیراق (القائمة العراقية الوطنية) ٢٥ نوێنەر
- بەرەی عیراقی بۆ دیالۆگی نیشتمانی (الجبهة العراقية للحوار الوطنی) ١١ نوێنەر
- یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان (الاتحاد الاسلامی الكردستاني) ٥ نوێنەر
- کوتلەی ئاشتبوونەوەو رزگاری (كتلة المصالحة و التحرير) ٣ نوێنەر
- رسالیەکان (الرساليون) ٢ نوێنەر

---

[٥٣] بەڵگە نامەی ژمارە ٢٦ وثيقة. تصديق النتائج النهاينة لأنتخابات مجلس النواب

- بەردی تورکمانی عیراق (الجبهة التركمانيه العراقية)

١ نوێنەر

- لیستی رافدەین (قائمة الرافدين)

١ نوێنەر

- لیستی مثال الألوسی (قائمة مثال الآلوسي)

١ نوێنەر

- بزوتنەوەی ئیزدی (الحركة الايزيدية)

١ نوێنەر

بەهۆی پابەندنەبوونی سەرۆکی حکومەت (د. ئیبراهیم جەعفەری) لەخولی رابردوودا (قۆناغی گواستنەوە) بە جێبەجێکردنی مادەی (٥٨)، سەرکردایەتی سیاسی کورد لەم خولەدا رەزامەندنەبوون بە دووبارە دانانەوەی (د. ئیبراهیم جەعفەری) بەسەرۆکی حکومەت.

لەژێر فشاری کوردا، بەناچاری لیستی هاوپەیمانی یەکگرتوی عیراق (الأئتلاف العراق الموحد) پێشنیاری (د. نوری مالکی) کرد بۆ سەرۆکی حکومەت، پاش وەرگرتنی پەیمانی زارەکی (د. نوری مالکی) لەلایەن سەرکردایەتی سیاسی کوردەوە بۆ جێبەجێکردنی مادەی (١٤٠)ی دەستوری هەمیشەیی عیراق، کە تایبەت بوو بەچارەنووسی ناوچە جێناکۆکەکان.

حکومەتی نیشتمانی بە سەرۆکایەتی (د. نوری مالکی) لە ٢٠٠٦/١/١٥ دەستبەکاربوو، بەرنامەی کاری حکومەت بۆ جێبەجێکردنی مادەی (١٤٠) بەسێ قۆناغدا دابەشکرا .[٥٤]

### قۆناغی ئاسایی کردنەوە

بەپێی بەرنامەی کاری حکومەت، بۆ راستکردنەوەی باری دیموگرافیو راستکردنەوەی سنوری کارگێری ناوچە جێناکۆکەکان، کە پێویست بوو تا ٢٠٠٧/٣/٣١ ئەنجام بدرێت.

### قۆناغی سەرژمێری

بەپێی بەرنامەی کاری حکومەت، پێویست بوو ئەم قۆناغە لە ٢٠٠٧/٧/٣٠ ئەنجام بدرێت.

### قۆناغی را پرسی

بەپێی بەرنامەی کاری حکومەت، پێویست بوو ئەم قۆناغە لە ٢٠٠٧/١١/١٥ ئەنجام بدرێت. دوای جێبەجێکردنی هەرسێ قۆناغەکە، پێویستبوو تەواوی برگەکانی مادەی (١٤٠)و چارەنوسی ناوچە جێناکۆکەکان لە٢٠٠٧/١٢/٣١ جێبەجێ بکرایەو کۆتایی بەکارەکانی بهێنایە.

---

[٥٤] بەڵگەنامەی ژمارە ٢٧

سەرباری دارشتنی بەرنامەی کاری حکومەت بۆ جێبەجێبەکردنی مادەی (١٤٠)، بەلاّم لەم خولەشدا حکومەت پاش تێپەربوونی ماوەیەکی زۆر، بەدۆخێکی سست کارەکانی ئاراستەکردو لەدەرئەنجامدا هەنگاوەکانی مایەی جێبەجێنەکردنی مادەی ١٤٠بوو. لەدەرئەنجامدا سەرجەم دەسەلاّتەکان (دەسەلاّتی هاوپەیمانی، ئەنجومەنی حوکم، حکومەتی د. ئەیاد عەلاوی، حکومەتی د. ئیبراهیم جەعفەری، حکومەتی د. نوری مالکی) لەسەردەمی عیراقی نوێدا لەساڵی (٢٠٠٣ ــ ٢٠٠٩) هەڵوێستیان لەئاست ناوچە جێناکۆکەکان هێشتنەوەی چارەنوسی ئەو ناوچانەبوو بە هەڵپەسێردراوی یاخود دواخستنیو حەواڵەکردنی بوو بۆ چارەنوسێکی نادیار.

## ناوچه‌جێناکۆکه‌کان و هه‌ڵوێستی سه‌رکردایه‌تی سیاسی کورد له‌ئاست ده‌سه‌ڵاته‌کانی سه‌رده‌می سیسته‌می پاشایه‌تی و کۆماری

له‌گه‌ڵ دامه‌زراندنی ده‌وڵه‌تی عیراق له‌ساڵی ١٩٢١و پاشان لکاندنی ویلایه‌تی موسڵ (کوردستانی باشور) له‌ساڵی ١٩٢٦ به ده‌وڵه‌تی عیراقه‌وه، کێشه‌ی سه‌ره‌کی میلله‌تی کوردو حکومه‌ته یه‌ك له‌دوای یه‌که‌کانی عیراق پێشێلکردنی مافه نه‌ته‌وه‌ییو به‌فه‌رمی نه‌ناسینی سنوری جوگرافی کوردستان بوو.

له‌ده‌ستوری هه‌میشه‌یی، سه‌رده‌می سیسته‌می پاشایه‌تی ١٩٢٥ -- ١٩٥٨، له‌هیچ یه‌کێك له‌ماده‌کانی ئه‌و ده‌ستوره‌دا ئاماژه به‌ناوی کورد نه‌کراوه.[٥٥]

له‌ده‌ستوری کاتی، سه‌رده‌می کۆماری ١٩٥٨، ناوی کورد وه‌ك هاوبه‌ش (شه‌ریك) له‌نیشتمانی عیراقیدا هاتووه، به‌ڵام هیچ ئاماژه‌یه‌ك به‌سنوری جوگرافی کوردستان نه‌کراوه. [٥٦]

له‌سه‌رده‌می ده‌سه‌ڵاتی رژێمی به‌عسدا، بۆ یه‌که‌مجار له‌مێژووی ده‌وڵه‌تی عیراقدا، زاراوه‌ی کوردستان بۆ ناوچه‌ی ئۆتۆنۆمی له‌به‌یاننامه‌ی ١١ ئازاری ساڵی١٩٧٠ بۆ سنوری پارێزگاکانی (هه‌ولێر ـ سلێمانی ـ دهۆك) به‌کارهات و چاره‌نووسی ناوچه‌کانی تری هه‌رێمی کوردستان، که ئێستا به ناوچه جێناکۆکه‌کان ناسراون، بڕیاردار له‌رێگه‌ی ئه‌نجامدانی پرۆسه‌ی ئاماره‌وه یه‌کلایی بکرێته‌وه. [٥٧]

---

٥٥ الدكتورة. كردستان سالم سعيد. أثر التعددية الأثنية على الوحدة الوطنية في العراق ص ١١١

٥٦ عبد الفتاح علي اليوتاني. التطورات السياسية في العراق ٢٠٠٧ ص٥١

٥٧ د. حامد محمود عيسى. القضية الكردية في العراق ص٦٣٥

لەتەواوی هەلومەرجەکانی رابردوو، لەناست پێشێلکردنی تەواوی مافە نەتەوەییەکانی میللەتی کورد لەلایەن رژێمە یەك لەدوای یەکەکانەوە، سەرکردایەتی سیاسی کورد لەچوارچێوەی سەرجەم شۆڕشەکانی میللەتی کورد سەرەڕای نەگەیشتن بە ئامانج، هەڵسوڕاوانە سەرکردایەتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی میللەتی کوردی کردووە لەڕووی سیاسیو چەکدارییەوە، بەئامانجی بەدیهێنانی مافە نەتەوەییو نیشتمانییەکان.

## ناوچە جێناكۆكەكان و هەڵوێستی سەركردایەتی سیاسی كورد لەئاست دەسەڵاتەكانی پاش پرۆسەی ئازادی ( سەردەمی عیراقی نوێ )

خاك بە یەكێك لەبنەما سەرەكیەكانی نەتەوە دادەنرێت. پاراستنی چوارچێوەی خاكی هەر نەتەوەیەك ئەركی سەرجەم تاكەكانی نەتەوەیە. لەپێش پرۆسەی ئازادی عیراق، لایەنی كوردی سەرباری بوونی دوو دەسەڵات لەهەرێمی كوردستاندا، لەچوارچێوەی ئۆپۆزسیۆنی عیراقیدا، بە بەراورد لەگەڵ سەرجەم لایەنو پێكهاتەكانی تر، لەرووی سیاسیو ئابوریو سەربازیو كارگێڕیو تەواوی بوارەكانی تر، دامەزراترو بەهێزتر بوو، لەهەمان كاتدا یەكێك بوو لەهاوپەیمانە بەهێزەكانی دەسەڵاتی هاوپەیمانی(سلطة الأئتلاف)

لەم هەلومەرجەدا، كاتێك تەرازووی هێز لەقازانجی لایەنی كوریدا بوو، پێویست بوو، سەركردایەتی سیاسی كورد، بەپێی بەرنامەیەكی دارێژراو و ئامادەكراو لەسەر بنەمای زانستیو پشتڕاستكراو بە بەڵگەو دۆكیومێنتی مێژوییو جوگرافیو بەكارهێنانی كارتی بەهێزی خۆی، لەڕێگەی دانوستانەوە لەگەڵ دەسەڵاتی هاوپەیمانانو لایەنەكانی تری ئۆپۆزسیۆنی عیراقی چارەنووسی تەواوی ناوچە جێناكۆكەكان یاخود بەشێك لەو ناوچانەی بەقازانجی لایەنی كوردی یەكلایی بكردایەتەوە.

لەپاش پرۆسەی ئازادی عیراق لە ٢٠٠٣/٤/٩، پاش راگەیاندنی دەستنیشانكردنی رۆژی ٢٠٠٣/٣/١٩ بە سنوری دەسەڵاتی حكومەتی هەرێمی كوردستان لەلایەن دەسەڵاتی هاوپەیمانان (سلطة الأئتلاف)، پێویست بوو دەسەڵاتی سیاسی كوردی، هەڵویستی راشكاوانەی

خـۆی بەقبوڵنـەکردنی ئـەو راگەیاندنـە، رابگەیـەنێتو داوای مـافی مێـژوویی میللـەتی کـوردی لەگەڕانـەوەی ناوچـە جێناکۆکـەکان بـۆ چوارچـێوەی سـنوری جـوگرافی هـەرێمی کوردسـتان، بەدەسـەڵاتی هاوپەیمانان بسەلماندایە.

لـەکاتی نوسـینو داڕشـتنی یاسـای بـەڕێوەبردنی دەوڵـەت بـۆ قۆنـاغی گواسـتنەوە، دووبـارە هەڵوێـستی سـەرکردایەتی سیاسـی کـورد سـەبارەت بەناوچـە جێناکۆکـەکان، لەئاسـتی داواکـاری میللـەتی کـوردا نـەبوو، کـە چارەنووسـی ئـەو ناوچـانە بـەپێی هـەردوو مـادەی (٥٣)و مـادەی (٥٨) سـپێردرا بەپرۆسـەی سـەرژمێرییەکی روونو دیـار بـێ دەستنیـشانکردنی کاتو چۆنێتی ئەنجامدانو هەڵێنجاندنی ئەنجامی ئەو سەرژمێرییە.

بەبێ ئامادەکردنی پرۆژەیەکی زانستیو خوێندنەوەیەکی واقیعانە بـۆ سـەرجەم ناوچـە جێناکۆکـەکان بەگـشتیو هەریـەك لـەو ناوچـانە بەتایبەتیو بەبێ ئامادەکردنی دوو جۆر بەرنامەی تایبەت بـەو ناوچانە لەسەر ئاستی لانی زۆر و لانی کەم . سەرکردایەتی سیاسی کورد لەڕێگەی نوێنەرانیـەوە لەلیژنـەی نوسـینو داڕشـتنی رەشنوسـی دەسـتور، مـادەی (٥٨)ی یاسـای بـەڕێوەبردنی دەوڵـەت، گوێزرایـەوەو لـەمادەی (١٤٠)ی دەستوری هەمیشەیی عیراقدا جێگیرکرا.

لەڕواڵەتـدا مـادەی (١٤٠) لەسـێ دەسـتەواژەی (ئاسـاییکردنەوە، سـەرژمێری، راپرسـی) پێکـدێت، بەدەستنیـشانکردنی مـاوەی جێبەجێکردنی، کە لە ٣١/١٢/ ٢٠٠٧ تێپەڕنەکات.

لەواقیعدا هەریەك لەو دەستەواژانە میکانیزمی جێبەجێکردنی زۆر ئالۆزەو پێویستی بە لێکۆڵینەوەو تاوتوێ کردنی کەسانی پسپۆڕو شارەزای بواری سیاسیو دەستووریو یاسایی هەیە.

دەستەواژەی یەکەم (ئاساییکردنەوە) کە بەقۆناغی یەکەم دادەنرێت میکانیزمی جێبەجێکردنی بریتییە لە (گەڕانەوەی ئاوارە و گێڕانەوەی عەرەبی هاوردەو گەڕانەوەی یەکە کارگێڕییەکان بۆ سنوری ئاسایی پارێزگای خۆیان).

پاش وردبوونەوە لەم قۆناغە، دەردەکەوێت پرۆسەی ئاساییکردنەوە ناکرێت لەماوەی سێ مانگدا جێبەجێبکرێت، هەرلەم قۆناغەشدا تەواوی کێشە مولکداریەکان ئاراستە بە دەستەی باڵای چارەسەکردنی کێشەی مولکدارێتی عیراق کرا، کە ئەم دەستەیە هیچ تایبەتمەندیەکی سیاسی بۆ ناوچە جێناکۆکەکان لەبەرچاو نەگرت، سستی جێبەجێکردنی کارەکانی ئەم دەستەیە لەسەرتاسەری عیراقدا رەنگیداوەتەوە.

بۆ گەڕانەوەی یەکە کارگێڕیە دابڕاوەکانیش پەیوەستکرا بە یەکە کارگێڕیە دابڕاوەکانی ناوەڕاستو باشوری عیراقو بۆ وەرگرتنی بڕیاری پەیوەندیدار بەم بڕگەیە، پێویست بەڕەزامەندی هەر سێ ئەندامی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی کۆمار دەکات، کە پێکهاتەکەی بریتین لەهەر سێ پێکهاتەی (کورد، عەرەبی سوننە، عەرەبی شیعە)، لەهیچ کاتێکدا کۆدەنگی بڕیار لەسەر ئەم بڕگەیە بە ئەنجام ناگات.

دەستەواژەی دووەم (سەرژمێری)، کە بەقۆناغی دووەم دادەنرێت، هیچ ئاماژەیەك بە دامەزراوەو لایەنی جێبەجێکەرو سەرپەرشتیاری ئەم پرۆسەیە نەدراوە.

دەستەواژەی  سێیەم (ڕاپرسی) کە بەقۆناغی سێیەم دادەنرێت هیچ ناماژەیەك بەچۆنێتی ئەنجامدانی ئەم پرۆسەیە نەکراوە لەڕووی دەستنیشانکردنی( دەزگا یاخود لایەنی جێبەجێکەر، دەزگا یاخود لایەنی سەرپەشتیار، ئەو کەسانەی بەشدار دەبن لەم پروسەیە، لەسەر چ ئاستێك ڕاپرسی ئەنجام بدرێت (پارێزگا ــ قەزا ــ ناحیە ــ گوند). فۆرمی پەسەندکراوی تایبەت بە پرسیارەکانی ڕاپرسی.چ دەزگایەك یاخود لایەنێك ئەنجامەکان دەردەهێنێت).

لەبەشی زۆری وەرچەرخانە مێژوییەکاندا، پێگەی میللەتی کورد لەچوارچێوەی سنوری جوگرافی دەوڵەتەکاندا پێکهاتەیەکی کەمینە بووە.

بەشێوەیەکی گشتی لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا زۆرکەم بایەخ بەکێشەی کەمینەکان دراوەو هیچ سیاسەتێکیش بۆ سەلماندنی مافی کەمینەکان بەدیناکرێت، سیاسەتی فەرمی دەوڵەتانی ناوچەکە هەمیشە خۆیان لەبوونی کەمینەکان بێئاگا کردووەو لەزۆربەی دەوڵەتەکاندا بەشێوازی جۆراوجۆر هەوڵدراوە بتوێنرێنەوەو تایبەتمەندی خۆیان لەدەست بدەن، بەوبیانوەی کەمینە هەڕەشەیەکی ترسناکن بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی پێکهاتەی دەسەڵاتدار. بەپێی هەلومەرجی واقعی ئەمڕۆ، کەرکوك و کێشەکەی سەرباری بەرخوردکردنی وەك کێشەیەکی ناوخۆیی، مەودایەکی هەرێمایەتی و نێودەوڵەتی وەرگرتووەو بەیەکێك لەکێشە هەڵپەسێردراوەکانی سیاسەتی نێودەوڵەتی ناوزەد دەکرێت.

لەدەرئەنجامی تەواوی سیاسەتەکانی رژێم لەپێش دروستبوون و دوای دروستبوونی دەوڵەتی عیراقی بەتایبەت سەردەمی فەرمانڕەوایی رژێمی بەعس لەپیادەکردنی سیاسەتی بەرکەنارکردنی سەرجەم پێکهاتە ئیتنی و ئایینی و مەزهەبییەکان و پێشێلکردنی تەواوی مافەسەرەتاییەکانی ئەو پێکهاتانەو پەیڕەوکردنی سیاسەتی شەڕەنگێزی لەناوچەکەو بەهەدەردانی تەواوی سامانی نەتەوەیی، هۆکاری داڕوخان و وێرانکاری ژێرخانی ئابوری و دواکەوتویی سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و ناوەدانی عیراق بووە.

پاش پرۆسەی ئازادی عیراق، ئۆپۆزسیۆنی عیراقی میراتگری وڵاتێکی وێرانکراو و داڕووخاو بوون لەسەرجەم بوارەکاندا، کە ئەرکیان چۆنێتی بنیاتنانەوەی عیراقێکی نوێو مودێرن بوو بە بەشداری سەرجەم پێکهاتەکانی لەسەر بنەمای دیموکراسیو قبولکردنی یەکترو لابردنی تەواوی ئاسەواری سیاسەتە نادروستەکانی رابردوو بەسیاسەتی پاکتاوی رەگەزیشەوە، لەسەر رێچکەی جێبەجێکردنی (نەخشە رێگا)ی دارێژراو لەدەرئەنجامی راسپاردەکانی زنجیرە کۆنگرەکانی ئۆپۆزسیۆنی عیراق لە (ڤیەننا – لەندەن – هەولێر).

## دیدی سیاسی پێکهاتەکانی

## (کورد، تورکمان، عەرەب، کلدۆئاشور)

دیـدی سیاسـی هەریـەك لەپێکهاتـەکانی (کـورد، تورکمـان، عـەرەب، کلدۆئاشـور) ڕەنگدانـەوەی هەلومـەرجی واقعـی ژیـانی سیاسـی کۆمـەڵگای عیراقـیو تێڕوانینـی هـەر یـەك لەپێکهاتەکانـە بـۆ کۆڵەکـەو بنـەما نـەگۆڕەکانی دروسـتبوونی دەوڵـەتی عیراقـیو پیـادەکردنی شـێوازی دیکتاتۆرانـەو ڕەتکردنـەوەی فـەزای دیموکراسـیو پێـشێلکردنی مافـە سـەرەتاییەکانی تـاکی کۆمـەڵگای عیراقیـە لەلایـەن ڕژێمـە یـەك لـەدوای یەکەکانەوە.

خوێندنەوەی زانستیانە بـۆ پێگـەو هەڵوێستی پێکهاتـەکان، زەمینـەو ئاسـانکاری دەستنیـشانکردنی پێـشینەی سیاسـیو ڕۆڵـی هەریـەك لەپێکهاتەکان لەداڕشتنی چارەنووسی سیاسی کەرکوکدا دەکات .

### پێکهاتەی کورد

بەپێی دۆکیومێنتو بەڵگە مێژووییەکان، پێکهاتەی کـورد دانیـشتوانی ڕەسەنی ئەم پارێزگایەن.

لەهەردوو سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیو دەوڵەتی عیراقیدا بەتایبـەت هـەردوو سـەردەمی دەسـەڵاتی (ئیتیحـادو تـەرەقی) و(ڕژێمـی بـەعس)دا بـەهۆی جێبـەجێکردنی سیاسـەتی شـۆفینیانەی هـەردوو نەتـەوەی سەردەستی (تـورکو عـەرەب) پێکهاتـەی کـورد وەك نەتـەوەی بـن دەسـت مامەڵـەی لەگەڵـدا دەکـراو بـەردەوام پێگـەی خـۆی لەئۆپۆزسـیۆندا بەدیدەکرد.

لەگەڵ زیاتر خەستبوونەوەی ستەمی نەتەوایەتیو هەوڵدان بۆ سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوایەتی کورد لەکوردستانی عیراق بەگشتیو پارێزگای کەرکوك بەتایبەتی ئەویش لەڕێگەی پیادەکردنی دڕندانەترین شێوازی چەوسانەوە بەتایبەت لەدوای شەستەکانی سەدەی رابردووەوە.

بەم پێیە پێکهاتەی کورد لەپارێزگای کەرکوك لەئەنجامی ڕووبەڕووبوونەوەی بۆ سەرجەم شێوازەکانی چەوسانەوەو بەمەبەستی بەرگری لەناسنامەی نەتەوەیی خۆی، بەناچاری هەموو شێوازێکی خەباتی (سیاسی، چەکداری، رۆشنبیری....) لەچوارچێوەی خەباتی رزگاریخوازی گەلی کورد لەکوردستانی عیراقدا گرتۆتە بەرو، لەو میانەدا پەی بەتەواوی بوارەکانی زانستی سیاسیو بەهاکانی دیموکراسیو مافی چارەی خۆنووسینو ئاشتیو پێکەوە ژیانی میللەتان بردووە. لەم ڕووەوە پێشینەی سیاسی پێکهاتەی کورد لەپارێزگای کەرکوکدا، پێشینەیەکی مێژوویی خاوەن ئەزموونو ئەرکی قورسی لەچۆنێتی بەهێزکردنی خاڵە هاوبەشەکانو ریزبەندکردنی خاڵە جیاوازو ناکۆکەکانی نێوان پێکهاتەکانو بالاکردنی زمانی دیالۆگ ( لغة الحوار) وەك تاکە ڕێگای چارەسەرکردنی مەدەنیو مۆدێرنانەی تەواوی ناکۆکیەکان بەئاراستەی زامنکردنی پێکەوە ژیانی ئاشتیانەی پێکهاتەکانی دەکەوێتە ئەستۆ.

بەگشتی کرۆکی داخوازییەکانی ئەم پێکهاتەیە هەڵقوڵاوی رەتکردنەوەی واقعی ژێر دەستەییو پاراستنی ناسنامەو بەدیهێنانی ئامانجی نەتەوەییو لابردنی ئاسەواری پاکتاوی رەگەزیو ئاساییکردنەوەی باری ئەتنۆگرافی ناوچە جێناکۆکەکانە، کەتەواوی داخوازییەکان، داخوازی مێژوویی سیاسی بابەتیانەیە، کە ئەمڕۆ

لەچوارچێوەی دەستورو یاسادا رێوشوێنی چارەسەرکردنی دەستنیشان کراوە.

## (( پێکهاتەی تورکمان ))

مێژووی هاتنی پێکهاتەی تورکمان بۆ ناوچەکە، بیروڕای جیاوازی لەسەرە، سەرجەمی هۆکارەکان بەهۆکاری ئابوری‌و سیاسیەوە فاکتەری هاتنی ئەم پێکهاتەیەن بۆ ناوچەکە.

لەماوەی دەسەڵاتی عوسمانیدا بەشداریەکی فراوانییان لەبەڕێوەبردنی دامودەزگا حکومیەکاندا بینیوە، شکستو روخانی دەوڵەتی عوسمانی، کۆتایی بە چەرخی پرشنگداری ئەم پێکهاتەیە هێنا.

پێکهاتەی تورکمان رێژەیەکی زۆرکەمی ژمارەی دانیشتوانی عیراق پێکدەهێنێت‌و لەڕووی ئایینەوە موسوڵمانن‌و دابەشدەبن بەسەر هەر دوو مەزهەبی سوونن‌و شیعەدا.

بەدرێژایی مێژووی دەوڵەتی عیراق، ئەم پێکهاتەیە رووبەرووی هەردوو شێوازی چەوسانەوەی نەتەوەیی ومەزهەبی بوونەوە، تەواوی مافە نەتەوەیی‌و مەزهەبی‌و رۆشنبیری‌و کەلتوری‌و فەرهەنگییەکانیان پێشێلکراوە.

بەهۆی کەمی رێژەی دانیشتوان‌و تایبەتمەندی پێگەی ئەم پێکهاتەیە، کاردانەوەی سیاسی‌و چالاکیان لەبواری داخوازی مافەکانی خۆیان ئەنجام نەداوە، زیاتر لەهەوڵی خۆگونجاندن لەگەڵ رژێمی دەسەڵاتدارو سەرقاڵی بواری ئابوری‌و باشترکردنی گوزەرانی خۆیان بوون.

لەپاش پرۆسەی ئازادی عیراق، بەهۆی نەتەوەپەرستی تورك و شیعەگەریتی ئێران و كەمی ئەزموون و نەبوونی پێشینەی سیاسی خۆیان، ناڕۆشنی لە داخوازییەكانیان، لەداخوازی نەتەوەیی و مەزهەبی و دووركەوتنەوە لەداخوازی واقعی پێكهاتەكەدا بەدیدەكرێت.

(( پێكهاتەی عەرەب ))

١. عەرەبی سوننە

مێژووی هاتنی ئەم پێكهاتەیە بۆ پارێزگای كەركوك، بە شێوەیەكی سەرەكی دەگەڕێتەوە بۆ دوای دروستبوونی دەوڵەتی عیراقی و پاش جێبەجێكردنی یەكەم قۆناغی سیاسەتی پاكتاوی رەگەزی لەسییەكانی سەدەی رابردوو.

لەدەوڵەتی عیراقدا ئەم پێكهاتەیە وەك نەتەوەی سەردەست مامەڵەی لەگەڵدا كراوەو تەواوی سیاسەتی رژێمە یەك لەدوای یەكەكان لەخزمەتی ئەم پێكهاتەیەدا بوون.

بەشێوەیەكی گشتی زاڵبوونی بیری نەتەوەپەرستی عەرەب لەسەر هەڵوێست و تەواوی بوارەكانی ژیانی ئەم پێكهاتەیەدا رەنگیداوەتەوەو بەردەوام وەك ئامرازی جێبەجێكردنی سیاسەتی شۆڤێنینانەی رژێمەكان بەكارهاتوون.

لەدوای پرۆسەی ئازادی عیراق، ئەم پێكهاتەیە وەك هێزێكی شكست خواردوو، مامەڵەی دوژمنانەی لەگەڵ هەلومەرجی نوێی عیراقدا دەكردو هەڵویستی دورە پەرێزی لەئاست پرۆسەی سیاسی بەدیموكراتیزەكردنی عیراقدا وەرگرت، بوو بەناوەندێك لەژێر كاریگەری بیری نەتەوە پەرستی

ولاتانی عەرەبی‌و تۆڕی ڕێکخراوە تیرۆریستیەکانی جیهان، بەرخوردی دەکرد.

٢. ((عەرەبی شیعە))

مێژووی هاتنی ئەم پێکهاتەیە، بەشێوەیەکی بەرچاو دەگەڕێتەوە بۆ حەفتاکانی سەدەی رابردوو لەچوارچێوەی جێبەجێکردنی سیاسەتی پاکتاوی رەگەزیدا .

ئەم پێکهاتەیە لەچوارچێوەی گشتی عیراقدا، لەژێر کاریگەری سیاسەتی چەوسانەوەی مەزهەبیدا، لە سەرەتاییترین مافەکانی خۆیان بێبەشبوون.

لەدوای پرۆسەی ئازادی عیراق، ئەم پێکهاتەیە لەپارێزگای کەرکوکدا دژ بە پێکهاتە رەسەنەکانی پارێزگاکە دژایەتی جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ دەکات، کەلەسایەی سیاسەتی پاکتاوی رەگەزیدا لەناوچەکەدا بەدەستیهێناوە، بۆ ئەم مەبەستەش هاوپەیمانێتی لایەن‌و ڕێکخراوە نەتەوە پەرستەکانی عەرەب‌و تورکمان دەکات، سەرباری کاریگەری شیعەگەرێتی ئێران لەسەریان.

(( پێکهاتەی کلدۆئاشور))

ئەم پێکهاتەیە لەرابردوودا، لەژێر کاریگەری سیاسەتی چەوسانەوەی نەتەوەیی‌و مەزهەبیدا، لە هەلومەرجێکی دژوار دەژیان‌و بەشی هەرە زۆریان ئاوارەی هەندەران بوون.

بەشێوەیەکی گشتی ئەم پێکهاتەیە بەهۆی کەمی ژمارەی دانیشتوانیان لەپارێزگای کەرکوکدا رۆڵی کارایان لەچارەنوسی سیاسی ناوچەکەدا نییە.

داخوازی ئەم پێکهاتەیە، رەخساندنی زەمینەی دیموکراسیو پارستنی ئەمینەتو بەدیهێنانی ئامانجە ئایینیو رۆشنبیریو کەلتوریەکانیانن.

بەم پێیە سیاسەتی رژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عیراق، بەجێبەجێکردنی سیاسەتی ناعادیلانە، ناڕاستە بەگۆڕینی باری ئەثنۆگرافیو دیمۆگرافی پارێزگاکەو دەستێوەردانی سیاسەتی ئیقلیمیو نێودەوڵەتی، هۆکاری دروستبوونی جیاوازی بیروڕای پێکهاتەکانن لەچۆنێتی چارەسەری کێشەکەو دەستنیشانکردنی چارەنوسی پارێزگاکە.

تەواوی پێکهاتەکان کەوتونەتە بەردەم پرسێکی مێژوویی گەورە لەبڕیاردان بەناڕاستەی چارەسەرکردنی کێشەکە، بەلەبەرچاوگرتنی بنەمای دیموکراسیو قبولکردنی یەکترو پتەوکردنی خاڵە هاوبەشەکانو گرتنە بەری رێگەی گفتوگۆ (مبدأ الحوار) لەخاڵە جیاوازو هەڵپەسێردراوەکان، کە لەدەرئەنجامدا هاوکێشەکە گوزارشت لەپاراستنی ئاسایشی کەرکوكو زەمینەسازی گەشەکردنو رەخساندنی بواری بەشداربونی سەرجەم پێکهاتەکان لەچۆنیەتی بنیاتنانەوەی ژیانی (سیاسی ، ئابوری ، کۆمەڵایەتی ، شارستانی، کەلتوری ، فەرهەنگی ...)دەکات.

سەرەڕای کەمی سەرچاوە مێژووییەکان، بەڵام سەرجەم بەڵگەی مێژوویی و دۆکیومێنتاری و ئەو ئامارانەی لەهەلومەرجی پێش ئەنجامدانی سیاسەتی پاکتاوی رەگەزی ئەنجامدراون، جەخت لەکوردستانی بوونی شاری کەرکوک و زۆرینەی پێکهاتەی کورد لەناوچەکەدا دەکەن.

ــ ئەندازیاری روسی (یوسف چیرنیك) لەماوەی (١٨٧٢-١٨٧٣) دا، گەشتێکی زانستی بۆ ناوچەی کەرکوك ئەنجام دەدات، لەبەڵگەنامەیەکی مێژووییدا کە لەگۆڤاری کۆمەڵەی جوگرافی روسیدا لەساڵی ١٨٧٩ بڵاوکراتەوە، چیرنیك ژمارەی دانیشتوانی شاری کەرکوکی بە ١٥ هەزار کەس خەمڵاندووەو تیایدا ئاماژە بەوە دەکات، کە جگە لە٤٠ خێزانی ئەرمەنی سەرجەمی دانیشتوانی کەرکوك کوردن.[٥٨]

ــ قاموسی ئیعلامی عوسمانی لەساڵی ١٨٩٨، ژمارەی دانیشتوانی شاری کەرکوکی بە ٣٠هەزار کەس و ژمارەی پێکهاتەی کوردی بە ٣/٤ ژمارەی دانیشتوانەکە خەمڵاندووە.[٥٩]

ــ یەکەم سەرژمێری باوەڕپێکراو لەماوەی چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، لەلایەن لیژنەی کۆمەڵەی نەتەوەکان لەساڵی ١٩٢٥دا ئەنجامدرا، بە سەرژمێری ئەم لیژنەیە ژمارەی دانیشتوانی پارێزگای

---

٥٨ یوسف چیرنیك. بەرگی شەشەمی گۆڤاری کۆمەڵەی جوگرافی پاشایەتی روسی قەفقاس لەساڵی ١٨٧٩. گۆڤاری کەرکوك ژمارە ٤ . ل ٦٠

٥٩ شمس الدين سامي. قاموس الأعلام التركي. مطبعة مهران. استنبول ١٨٩١

کەرکوك ۱۳۸۸٥۰ کەس و ڕێژەی سەدی پێکهاتەی کورد لەم سەرژمێریە ٦٣٪ بووە.[٦٠]

ـ سەرژمێری ساڵی ۱۹٥۷ بەباشترین سەرژمێری عیراق دادەنرێت، بەپێی ئەم سەرژمێریە ژمارەی دانیشتوانی پارێزگای کەرکوك ۲۸۸۹۱۲ کەس بووە بەژمارەی پێکهاتەکان بەم شێوەبە

ـ ژمارەی دانیشتوانی پێکهاتەی کورد ۱۸۷٥۹۳ کەس

ـ ژمارەی دانیشتوانی پێکهاتەی عەرەب ۱۰۹٦۲۰کەس

ـ ژمارەی دانیشتوان پێکهاتەی تورکمان ۸۳۳۷۱ کەس

ـ ئەو بەشەی دەمێنێتەوە، ژمارەی دانیشتوانی پێکهاتەکانی تر بووە.[٦١]

بەدڵنیاییەوە ئامانجی ئێمە لەم بابەتەدا، گومان خستنە سەر سەلماندنی کوردستانی بوونی کەرکوك‌و ناوچە جێناکۆکەکان نییە، بەڵکو شیکاریەکی بابەتیانەو هەڵسەنگاندنی واقعبینانەی ئەو ناوچەنەیە لەڕووی مێژوویی‌و سیاسی‌و دەستنیشانکردنی کەموکوڕی ڕەوشی سیاسی کەرکوك‌و هەڵوێستی سەرکردایەتی سیاسی کوردو ئەدانی دەسەڵاتی کوردی لەو ناوچانەو ڕەخنەی بنیاتنەرانەیە بۆیان، بە مەبەستی پاراستنی دەسکەوتەکان‌و بەشداری پێکردنی پێکهاتەی کوردی ئەو ناوچانە لەو پرسە هەستیارەو هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی میتۆدو ئەڵتەرناتیفی گونجاوتر بەئامانجی بەرجەستەکردن‌و بەعەمەلی کردنی هەنگاوەکان، بە لەبەرچاوگرتنی ناهاوسەنگی تەرازوی هێزی

[٦٠] عوني الداوردي. كركوك رحلة في ذاكرة التاريخ. ص١٦
[٦١] الدكتور خليل اسماعيل محمد. كركوك دراسات في التكوين القومي للسكان. الطبعة الاولى ص٣٢

سیاسـی(نێودەوڵـەتی ، ئقلیمـی، عیراقـی) و(کـوردی)، کـە بڕیـاردەرن لەچارەسـەرکردنی چارەنوسـی ئـەو ناوچـانە. لەهەمانکاتـدا کردنـەوەی دەرگای گفتوگۆ بەرووی پێکهاتەکانی ترو گرتنەبەری زمانی دیالۆگ (لغة الحوار)و نیشاندانی نیەتی ئاشتی راستەقینەو دروست بۆیـان لەسـەرجەم بوارەکـانی (سیاسـی، بـەڕێوەبردن ، ئاشـتیو پێکـەوە ژیـان، عەدالـەت، رێزگرتنی یاسا ، ناوەدانکردنەوە، خزمەتگوزاری .....)

## هەڵسەنگاندان

بەشێوەیەکی گشتی هەڵسەنگاندنەکان لەچوارچێوەی هەلومەرجی رابردوودا، کۆبەند دەبێت لە:

* نەتوانینی سەلماندنی کوردستانی بوونی ئەو ناوچانە لەپێش پرۆسەی ئازادی عیراق، لەکاتێکدا کە پێگەی سیاسی کورد لەهاوکێشەی نێودەوڵەتیو عیراقیدا بەهێزبوو.

* نەتوانینی سەپاندنی دیفاکتۆی کوردستانی بوونی ئەو ناوچانە لەدوای پرۆسەی ئازادی عیراق، بە هۆی بوونی دوو ئیدارەی کوردیو نەبونی یەك بەرنامەی کارو دوورکەوتنەوەو ونبوونی بەرنامەی (سیاسی، نەتەوایەتی)و سەرقاڵبونی هێزە سیاسییە کوردییەکان بەدەسکەوتی کاتیو نەنجامدانی تاڵانو پەلاماری شوێنو دەزگاگشتیەکان، کە سەرەنجام ناشیرینکردنی وێنەی کوردی لای پێکهاتەکانی تری لێکەوتەوە.

* ناڕۆشنی سیاسەتی هاوپەیمانان لەئاست داخوازیە سیاسییە رەواکانی میللەتی کورد.

* لاوازبوونی پێگەی سیاسی کورد لەهاوکێشەکانو دابەزاندنی ئاستی چارەسەری مێژوییو سیاسییانەی داخوازیە نەتەوەییەکان بۆ ئاستی چارەسەری دەستوریو یاسایی.

* هەڵوێست وەرنەگرتنی سەرکردایەتی سیاسی کورد لەئەنجام نەدانی (مانگرتنی مەدەنیانە، کشانەوە لەدەسەڵاتی حکومەتی فیدراڵی ......) لەئاست پابەندنەبوونی حکومەتی عیراقی فیدراڵ بەمادە دەستوریو یاساییەکانی (٥٨ ـ ١٤٠ ـ ٢٣ ).

* پابەند نەبوونی سەرکردایەتیو هێزی سیاسی کورد بەریزبەندیکردنی ناکۆکیەکان بەشێوەیەکی زانستی لەڕووی سەرەکیو لاوەکیەوە، تێکدانی ئەو ریزبەندیەو. بەئەولەویەتکردنی ناکۆکی لاوەکیو کێشە ناوخۆییەکانو بەر کەنارکردنو بەکەمگرتنی ناکۆکییە سەرەکیەکانی سیاسەتی (نێودەوڵەتی، ئقلیمی، عیراقی) کە رێگرن لەبەردەم بەدیهێنانی ئامانجە نەتەوەییەکانی پرسی مێژوویی کورد لەکوردستانی عیراقدا.

* نەبوونی خوێندنەوەی واقعبییانەی کورد بۆ هەڵسەنگاندنی حکومەتی فیدارڵی عیراقو ئەنجامنەدانی لێکۆلینەوەی زانستیانە سەبارەت رەوشی جێبەجێکردنی قۆناغەکانی (ئاساییکردنەوە، سەرژمێری ، راپرسی)ی مادەی ١٤٠. کە بێ گومان سێ مانگ بۆ قۆناغی ئاسایکردنەوە کە قۆناغێکی بنەڕەتی مادەی (١٤٠)ە، بەهیچ پێوانەیەك بارتەقای حەفتا ساڵی پرۆسەی (تەرحیلو تەعریبو پاکتاوی رەگەزیو دابڕینی یەکەی کارگێڕی قەزاو ناحیەکانو....)ناکات.

لەدەرئەنجامدا پەلەکردنو شپرزەییو بێ بەرنامەیی گەڕانەوەی ئاوارەکان لەهەلومەرجێکی نائینسانی زۆر دژوارو بێ بەش لەخزمەتگوزاریو زیادەڕەویکردنە سەر مولکی گشتیو تایبەتو دروستکردنی گەڕەکی نوێی ئاوارە، بەبێ لەبەرچاوگرتنی بنەمای نەخشەسازیو دیزاین، کاردانەوەی نێگەتیڤانەی پێکهاتەکانی تری لێکەوتەوە.

* لەدوای پروسەی ئازادی عیراق، بەهۆی دوورکەوتنەوەی پێکهاتەی عەرەب لەهەلومەرجی سیاسی نوێو توندڕەوی بەرەی تورکمانیو پێگەی

موحافیزکـاری بەشـی زۆری پێکهاتـەی تورکمـان، دەسـەڵاتی کـوردی لەکـەرکوك هاتـە کایـەوەو پێکهاتـەی کـورد وەك حـاکمی ئـەو ناوچـانە لەڕواڵەتـدا دەرکـەوت، چـونکە تـەنها بۆشـایی لێپرسـراوی یەکـەمی فەرمانگەکانیان، پڕکردەوە، بەبێ گۆڕینو بەشداریکردنی بنکەی فراوانی فەرمانگەکان کە بەشی هەرە زۆریان عەرەبو تورکمان بوون.

* دروسـتبوونی نـاکۆکیو کبێرکێـی حزبـی لـەنێوان لایەنـە سیاسـییە کوردیەکانو نەبوونی یەك خیتابی سیاسی کوردیو دروستبوونی خیتابی وروژێنەر .

* شـپرزەیی مامەڵـەکردنی مـادەی ١٤٠و دروسـتکردنی لیژنـەی جۆراوجۆر بۆ ئەو مادەیەو نارۆشنی ئەرکەکانیان.

* پیادەکردنی سیاسەتی کلاسیکی رۆژهەڵاتیانە لەلایەن سەرکردایەتی سیاسی کوردی، لەدروستکردنی لایەنو رێکخراوی سیاسی سێبەرو پاشکۆ لەپێکهاتـەکانی تـر، کـە هـیچ پێگەیـەکی سیاسـیو کۆمەڵایـەتیان لـەنێو پێکهاتـەکانی خۆیاندانییـە، کـە بـێ گومـان مایـەی نیگـەرانیو دوورکەوتنەوەو لێکترازانـدنی پەیوەنـدی ئـەو پێکهاتانەیـە بـە پێکهاتـەی کوردەوە.

* پێنـەدانی پۆستی بـاڵا لەحکومـەتی هـەرێمی کوردستانو بەشـداری پێنـەکردنی پێکهاتـەکانی (تورکمـانو عـەرەب) لەداڕشـتنی رەشنوسـی دەستوری هەرێمی کوردستان.

* چـاودێری نـەکردنی ووردی سـەرکردایەتی سیاسـی کـورد بـۆ هەلومەرجی ئیداری ئەو ناوچانەو لاوازی بواری ئاوەدانکردنەوە.

* نــەبونی هــەوڵی جدیانــەی پێکهاتــەکان بــۆ دروســتکردنی یــەك هەڵوێستی لەسەر بنەمای سازاندن سەبارەت بەمادەی ١٤٠.

## ڕاسپارده

ئەرکی پێویسیت لەم هەلومەرجەدا، پێکهێنانی دەزگایەکی تایبەتە بەتەواوی زانیارییەکان لەسەرجەم بوارەکانی پەیوەندیدار بەناوچە جێناکۆکەکانو پێکهێنانی لیژنەیەکی پسپۆڕ لەبوارەکانی (مێژوو، جواگرافیا، ئاسایشی نەتەوەیی، یاسا، دەستور، زانستی سەرژمێریو راپرسی، دیبلۆماسیەت، دانوستان ....). ئەرکی سەرەکی ئەم لیژنە پسپۆرە ووردبینی کردنی زانیاریەکانی پەیوەست بەناوچە جێناکۆکەکانو هەڵسەنگاندنی زانستیانەی هەلومەرجی واقعی ناوچە جێناکۆکەکانو دەستنیشانکردنی تەواوی کەموکورپەکانو بەراوردکردنی تواناى راستەقینەی سەرکردایەتیو هێزی سیاسی کوردیو پێگەی لەنێو هاوکێشەی سیاسی نێودەوڵەتیو ئقلیمیو عیراقیدا، بەمەبەستی ئامادەکردنی:-

١. بەرنامەی سیاسی (لانی زۆر)و (لای کەم)و پابەندبوونی سەرکردایەتی سیاسی کورد، بەپیادەکردنی لەکاتی گفتوگۆو دانوستانەکاندا

٢ـ بەرنامەی کاری سیاسی - ئیداری، دەسەلاتی کوردی لەناوچە جێناکۆکەکاندا، بەئامانجی گەشەپێدانی پردی پەیوەندیو گێڕانەوەی متمانەو جێگیرکردنی بنەمای (ئاشتیو پێکەوە ژیان)ی نێوان پێکهاتەکانو بەرنامەرێژیی بواری ئاوەدانکردنەوەو پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بەشێوەیەکی عادیلانەو هەوڵدان بۆ جوانکردنی سیمای دەسەلاتی سیاسیو ئیداری.

